# ڕامان لەقورئان

ئەندازیار عوسمان محەمەد ڕەشید

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## رامان و چەند ووشەیەك

سوپاس وستایشی بیٚپایان بۆ خوای پەروەردگاری جیهان ودروودو سەلامیش لەسەر گیانی سەرداری پیٚغەمبەران ویارو یاوەر و شویٚن کەوتوان..

وەك مەحوی دەلیٚت :

کە هەلگیرسا لە نووری بادە شەمعی حوسنی جانانە

نەچیٚتە سەر تەریقەی حەزرەتی پـەروانە دلٚ چـبکا

واتە :کاتیٚ بەهۆی نووری پاکی خۆشەویستی راستی‌یەوە ، دلٚ رووناك بووەوە و بەرخوردار بوو لەو خۆشـی‌یە بیٚ سنوورە، ئیتر بیٚجگە لە ریٚگای پەروانە کە خۆسـووتاندنە لـە پیٚـناوی خۆشەویسـتدا ، چ ریٚگایـەك هەیـە کـە لـەوە باشـترو مەزنتر بیٚت ؟؟

بە نووری بادە کەشفی زولٚمەتی تەقوا نەکەم چی‌بکەم

بە شەمعیٚکی وەها چاری شەویٚکی وانەکەم  چی‌بکەم

واتـە : ئەگـەر بـەهۆی یارمـەتی نـووری یەزدانـەوە ریٚگـای تـاریك و نووتـەك بەخواپەرستی رووناك نەکەمـەوە و، بەو رووناکی و تیشـکە چاری شـەویٚکی واتاریك نەکەم و خـۆم نەگەیەنمە خۆشەویستی راستی ، ئەبیٚ بیٚجگە لەمە چی هەبیٚ ، کەوا بتوانیٚ چارەسەرم بۆبکات ؟؟

جا ئەگـەر لـەدنیای ئەدەبیاتـەوە بگوازیـنەوە بـۆ زەمیـنی واقیعـی ئەمـڕۆمان و وردبینەوە ، بۆمـان دەردەکەویٚت کە ڕۆنـی ئەو چراو ڕۆحـی ئەو مەشـخەلٚە لـە قورئانەوە نەبیٚت سەرچاوە ناگریٚ ..

بۆیـه پێویستمان به هونەرێك هەیه بۆ تێڕامان ، به ڕێبەرێك هەیه بۆ تێفکرین له گەوهەری ئایەتەکان و مەوداو مانای سوورەتەکان و یاساو ڕێسای پێکەوە گرێ بەستی تەواوی موفرەدەو بابەتەکانی قورئانی پیرۆز..

قورئـان وەك مەوسـوعەیەکی بـەر فـراوان لێـوان لێـوە لـە ڕەهـەندی مێژوویـی‌و کۆمەڵایـەتی‌و دەروونـی‌و زانسـتی ، جـا داڕشـتنی ئـەم ڕەهەندانـە بـە فۆرمەلەکـردنێکی ئەدەبی‌وتێهەڵکێشـی چـەندان بـواری زانسـتی و سـەرەداوی مەعریفی وای کردووه کـه ئاسان نەبێت بەبێ ڕێبەر بتوانی پەی به نهێنیەکانی بەریت ..

لێرەوە گرنگی ئەم بابەتەمان بۆدەردەکەوێت کە لەگەڵ پەڕاوەکانی پێشتریدا ڕەنج ومـاندووبوونی دەیـان سـاڵن و، نـزاکارن لـەبارەگای پـەروەردگار کەلێـنێك پڕبکەنەوە لە کتێبخانەی کوردی‌دا ..

ئێمەش لەگەڵ ئەوەدا کە داوای قبووڵ بوون و سەرفرازی دنیاو قیامەت دەکەین بۆ نووسـەر ، هیواخوازیـن کـه پسـپۆڕانی بـواری قورئـان زیاتـر لابکەنـەوە بەلای دیراسـاتی قورئـانیداو چییان پێدەکـرێت بـیخـەنه بـەردەم قورئـان دۆسـتان و ، خواش پاداشتی چاکەکاران زایه ناکات ..

عادل شاسواری

٢٠٠٣/٥/١٨

## پێشەکی

سوپاس وستایشی بێپایان بۆ خوای پەروەردگاری جیهان ودروودو سەلامیش لەسەر گیانی سەرداری پێغەمبەران ویارو یاوەر و شوێن کەوتوان..

خـوای گـەورە قورئـانی پـیرۆزی نـاردووە تـاوەکو لەئایەتـەکانی وردبینـەوەو بەچاکی شارەزای بین وپەیڕەوی بکەین ، هەروەك دەفەرموێت ( كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ) (ص:٢٩)واتـە: ئـەم قورئانـە پەڕاوێکی پیرۆزە دامانبەزاندووە بۆلای تۆ، بۆ ئەوەی لە ئایەتەکانی وردبنەوەو خاوەن بیرو هۆشەکانیش پەندو ئامۆژگاری لێوەرگرن.

ئـــەم ئایەتـــە لەمەککـــە هاتـــە خـــوارەوە و ، پـــاش ماوەیـــەك لەسورەتی(المؤمنون)داهەر لەمەککە جارێکی تر جەختی کردەوە لەسەر وورد بونەوە لە قورئان و فەرمووی:( أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا الْقَوْلَ أَمْ جَاءَهُمْ مَا لَمْ يَأْتِ آبَاءَهُمُ الْأَوَّلِينَ ، أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُ مُنْكِرُونَ ، أَمْ يَقُولُونَ بِهِ جِنَّةٌ بَلْ جَاءَهُمْ بِالْحَقِّ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ) (المؤمنون:٧٠) واتـە:ئایا ووردبونەتەوە لـەم گوفتارە ﴿کەئەم شێوازەش ( أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا الْقَوْلَ ) سەرزەنشتی تیایە بۆیان کە هەق وڕاستی‌یان پێشێل کردووەوپشتگوێیان خستووە..﴾ ڕەنگە ئەم پشت گوێخستنەشیان لەبەر ئەوە بێ کەئەم بەرنامەی کە بۆ ئەمان هاتووە شتی‌وا بۆ باوك وباپیرانیان نەنێردراوە ، ( دیارە ئەمانیش کوێرانە دوای باووباپیرانیان دەکەون )..یان لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەرەکەیان نەناسیوەو ئەوە بۆتە هـۆی ئەوەی کە بـڕوا بەپەیامەکـەی نەکـەن ، یـاخود (بێشـەرمانە) دەڵێـن : شـێتی سەری لێداوە ، نەخێر وانی‌یە ، بەڵکوڕاستی‌و هەقی بۆ هێناون ، بەڵام زۆربەیان ڕقیان لە ڕاستی‌یەو پیی سەغڵەتن ..

لە مەدینەش قورئان جارێکی دیکە جەختی کردەوە سەر ووردبونەوەو لەباسی دووڕووەکاندا فەرمووی ( أَفَلا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلافاً كَثِيراً ) (النساء:٨٢)
واتە: ئەوەبۆ سەرنجی قورئان نادەن ولێی وردنابنەوە؟خۆ ئەگەر لەلایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگە لەخوا بێگومان جیاوازی و دژایەتی‌یەکی زۆریان تیادەدۆزیەوە.
لەسورەتی (محمد)یش دا جارێکی دیکە لەمەدینە هەمان سەرزەنشتی دوو ڕووەکانی کرد و فەرمووی ( أَفَلا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا) (محمد:٢٤) واتە/ ئەوە بۆچی وردنابنەوە لە قورئان ؟ ئاخۆ دڵەکانیان قفڵ دراوە ؟ ئاشکرایە مرۆڤی بڕوادار لە قورئان بێزار نابێ‌و ، لەزۆر خوێندنەوەو دووبارە کردنەوەی دا هەرگیز عەجایباتەکانی‌دوایی نایەت.. بۆیە تا ڕۆژی قیامەت دەرگا والآیە بۆ هەرکەسێ بیەوێ لەقورئان وردبێتەوە.. خوای گەورەش بەفەزڵی خۆی ئەم نوسینە بکاتە هۆکارێك بۆ چاکتر وردبوونەوە و تێگەیشتنی زیاتر لە قورئان وسوودی موسڵمانان . .
ئێستاش فەرموون ئێوەو بنەماکانی وردبونەوە لەقورئان:

## یەکەم/هەموو وشەیەك لە قورئاندا جێی خۆی گرتووە :

ئەگەر باش وردبینەوە ، دەبینین پەیوەندی هەیە لەنێوان وشەکانی‌ئایەتێکی سوورەتێکدا و هەریەکەیان بەووردی‌و بە حیکمەت دانراوە ..بۆ نموونە :
**یەکەم**:هەر ووشەیەکی قورئانی پیرۆز وەك دەنکە مرواری‌یە ، کەبەتەنها بۆخۆی جوانە،کاتێك لەپارچەیەك ئاڵتونیش دا دائەنرێ ، هەرجوانە‌و،کاتێك ملوانکەیەکیشی لێ دروست دەکرێ هەر نایابەو دەگونجێ لەگەڵ دەنکەکانی تردا ...هیچ پیتێك یا ووشەیەك یان سەرو بۆرێك لەقورئاندا زیادە نی‌یە و بەبێ

هوودە نەهاتووە ودەستی پەروەردگار نەخشاندویەتی، ئەوەی تیۆی بگات سەری دەسورمیٚ لە گەورەیی وناوازەیی ئەم قورئانە..

قورئان دەفەرموێت ( خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمًّى أَلا هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ) (الزمر:٥)

واتە/ خواوەند ئاسمانەکان وزەوی لەسەر بنچینەی هەق وڕاستی دروست کردووە ، بەشێوەی کەوانەیی شەو بەسەر ڕۆژدا دەهێنێت وبەهەمان شێوەش ڕۆژیش بەسەر شەو دا دێنێت ، خۆرومانگیشی ڕام کردووەو ڕای هێناون ( لەفەرمانی دەرناچن و لەخزمەتی ئادەمیزاد دان )، هەریەکە لەوانە لەچەرخ وخولدان تا کاتێکی دیاری کراو، ئاگادارین هەر خوایە زۆر بەدەسەلاتەو لێخۆش بووە....لەم ئایەتەدا هەموو ووشەکان پەیوەندیان بەیەکەوە هەیەو، دیاردەی ڕۆژوشەویش پەیوەندی‌یان هەیە بەڕام کردنی زەوی‌و خۆر ومانگەوەو هەروەها پەیوەندیشیان هەیە بەخولاندنەوەو جولانی زەوی ومانگ وخۆرەوە کە هەریەکەیان لەخولگەی تایبەتی خۆی دا بۆماوەیەکی دیاری کراو بەردەوام دەبێ وهەریکەیان ئەجەلی خۆی هەیە ..

**دووەم/** قورئان باسی سەختی سزای دۆزەخ دەکات ودەفەرموێت:(وَلَئِنْ مَسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِنْ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ) (الانبياء:٤٦)

لێرەدا قورئان بۆدەرخستنی سەختی وگرانی‌سزای دۆزەخ باسی کاریگەری کەمترین سزا دەکات ، تاپێمان بسەلمێنێ ئەگەر بەکەمترین سزا ئاوا هاواریان لیٚ هەستیٚ وبەرگەی نەگرن ئەی دەبێت هەموو سزاکە چۆن بێت ؟؟.

لەم ئایەتەدا چەند ووشەیەك بەکار هاتووە کە هەمووی کار لەسەر کەم کردنەوە دەکەن، ( لَئِنْ) واتە : ئەگەر ، بۆ(تشکیك)ەو کەمی دەگەیەنێت،(مس)بەریان بکەویٚ ،وشەی(أصاب)ی بەکار نەهێناوە کەمانای

تـــووش بـــوون وبەركـــەوتنی زۆر وبـــەهێزە ، ( نَفْحَـــةٌ ) بۆنێكـــی كـــەم....
هەروەها(تنوين التنكير)ی هەیە كە بۆ مەبەستی كەم كردنەوە بەكار هاتووە....
(مِنْ عذابِ )بەشێك لەسزا نەك هـەموو سزاكە ! وشـەی(النكـال ، العقـاب )
بەكارنـــەهاتووە كـــە ســـزای گـــەورەترن ، (ربـــك)پـــەروەردگارت ، لـــەجیاتی
وشەی(القهار ،الجبار ،المنتقم) بەكارهاتووە...( لَيَقُولُنَّ ) (تأكيد)ی تیایە بە(لام) و
بە ( نونی تأكيد)، كە بەدڵنیایی زۆرەوە هاواریان لێهەڵدەستێ...
جامانـای ئایەتەكە بەم جـۆرەی لێدێـت: سوێند بـەخوا ئەگـەر كـەمێك لـە
هالاوی یان(بۆنی)سزای پەروەردگارت بێ بەسەریانا ، ئەوە خوانەناسان بەكوڵ
دەڵێن : هاوارو ئاهو ناڵە بۆ ئێمە، بەڕاستی ئێمە ستەمكار بوین... بەم شێوەیە
دەبینین كە هەموو یەكێ لە ووشەكان لە خزمەتی مانای ئایەتەكەدان كە ناكرێ
بگۆڕدرێن بۆ ووشەی تر.. هەروەها ئاشكراشە كە ئەم ئایەتە پەیوەندی هەیە بە
ئایەتـەكانی پێـش خـۆی ودوای خۆیـەوەو بـەجوانی جـێی خۆیكردۆتـەوە و
ڕۆڵیخۆی بینیوە لە سورەتی(الانبياء) دا...
**سێیەم** :قورئان باسی میوەی دنیا دەكات كـەبۆ خـواردن وگـەلێك شتی تـر
بەكاردێت ، وەك وشك كردنەوەو كردن بەدۆشاوو فرۆشتن و ..هتد ، بۆیە كە
باسی دەكات دەفەرموێت ( ومنها تأكلون ) ،بەلاّم بۆمیوەی بەهەشت كە تەنها
بۆ خواردنە دەفەرموێت (منها تأكلون ) :
( فانشانا لكم به جنات من نخيل واعنـاب ،لكـم فيـها فواكـه كثيرة و منـها
تاكلون ) المؤمنون /١٩، ئەمە لەدنیادا ، لە بەهەشتیشا (وتلك الجنة اورثتموها
بما كنتم تعملون لكم فيها فاكهة كثيرة منها تاكلون ) الزخرف ٧٣
كەواتە پیتی (و) بەمەبەست دانراوەو مانایەكی تر ئەدات بەدەستەوە ..

**بنەمای دووەم / دووبارەبوونەوەی ئایەت لەسەر مەسەلەیەك بۆ جەخت کردنە سەر ئەو مەسەلەیەو لەهەمان کاتدا یەکتری تەواو دەکەن ....**

ئەوەی کەسەیری قورئان دەکات چەند ئایەتێك دەبینێ لەسەر مەسەلەیەك دووبارەبۆتەوە ڕەنگە وابزانێ هەروا بێمەبەست دووبارە بۆتەوە، یان وابزانێ تەنها بۆ جەخت کردنە سەر ئەومەسەلەیە چەند جار باسکراوە، کە لەڕاستیدا ئەگەر ورد ببینەوە دەبینین دووبارەبوونەوەی هەرئایەتێك، بۆ جەخت کردنە لەلایەك ولەلایەکی تریشەوە تەواو کردنی لایەنەکانی باسەکەیە،تاهەرچییەك پەیوەندی بەو باس و مەسەلەیەوە هەیە هەقی خۆی بدرێتی وبڕوادار بەرچاو ڕوون بێت... (تەنانەت چیرۆکی هەر گەلێك کە لە قورئان دا باسکراوەو لەچەند سوورەتێکدا دووبارە بۆتەوە، هەرجارەو چەند شتێکی نوێی لێباس دەکات کەبۆ ئەوشوێنە پێویستە )...

**نموونەی یەکەم/** لەقورئاندا لەدووجێگا دا باسی نەکوشتن وزیندە بەچاڵ نەکردنی منالْ هاتووە، ئەگەر لێی وردبینەوە یەکەمیان، جڵەوگیری دەکات لە کوشتنی منالْ ئەگەر لەبەر ئەوەبێت کە ئەو کەسە بترسێت لە داهاتوودا هەژار بکەوێت و نەتوانێ بەخێوی بکات، واتە ئێستاحاڵی باشەو لەداهاتوو دەترسێ، دووەمیش باسی حاڵەتێك دەکات کە کەسێك ئێستا هەژارەوبەبیانووی ئەوەی کە ناتوانێ ئێستا بەخێوی بکات ، مناڵەکەی خۆی دەکوژێت... دیارە ئەمە دووحاڵەتی جیاوازن وقورئان چارەسەری هەردووحاڵەتەکە دەکات ویەکتری تەواو دەکەن..

ئایەتییەکەم/( ولاتقتلوا أولادكم خشية إملاق، نحن نَرزقـهم وإياكم، إنَّ قتلَهم كـان خِطـأً كبـيرا)الإسـراء٣١ واتـە/ مناڵـەکانتان مـەکوژن لـە ترسـیهەژار

بوون(لەداهاتوو)، چونکە ئێمە ڕزق وڕۆزی ئەوان وئێوەش دەدەین، بەڕاستی کوشتن وزیندە بەچاڵکردنیان هەڵەیەکی گەورە بووە.

ئایەتی دووەم/( ولاتقتلوا أولادكم من إملاق ، نحن نرزقكم وإياهم)١٥١الانعام واتە/ مناڵەکانتان مەکوژن وزیندە بەچاڵیان مەکەن لەبەرئەوەی هەژارن ، چونکە ئێمە ڕۆزی ئێوەو ئەوانیش دەدەین... لەئایەتی یەکەمدا دەترسن مناڵەکە ببێتە مایەی هەژاریان لە داهاتودا وشەی(نرزقهم)ی پێش خستووە، واتە ڕزقیان لەگەڵ خۆیانەو، لەدووەم دا کەخۆیان هەژارن و دەترسن بەمناڵەکە زیاتر هەژاربن ،وشەی (نرزقكم) پێش دەخات واتە ڕزق وڕۆزی دەدەین بەئێوەو بەئەوانیش...

**نموونەی دووەم/** لەمەسەلەی شوێنکەوتن ولاسایی کردنەوەی کوێرانەی باوباپیراندا،دووئایەت هەیە ،یەکەمیان لە مەککەو دووەمیان لە مەدینە هاتۆتە خوارێ و ، لەیەکەمیاندا دەفەرموێ ( أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُنِيرٍ ، وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنْزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَى عَذَابِ السَّعِيرِ) (لقمان:٢١-٢٢) واتە/ ئایا سەرنجتان نەداوە کەبەڕاستی هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر هەمووی‌خوا بۆ خزمەتی ئێوەی دروستکردووەوبۆی ڕام کردوون، هەروەها بە فراوانی ناز نیعمەتی ئاشکراوپەنهانی بەسەردا ڕژاندون ، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لەخەڵکی موجادەلەو دەمە دەمێ نابەجێ دەربارەی خواو بەرنامەکەی دەکەن، بێ‌هیچ بەڵگەیەکی زانستی ورێنمایی‌یەکی پێغەمبەران و پەڕاوێکی ڕوون کەرەوەی خوایی... کاتێکیش پێیان بوترێت شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەون کەخوا ناردوویەتی، ئەوە دەڵێن: نەخێر شوێن ئەوە ناکەوین، بەڵکو هەر شوێنی ئەو شتانە دەکەوین کە باووباپیران

وماموستایانمان پەیڕەوییان لێکردووە، ئایا ئەگەر شەیتانیش بانگی کردبن بۆ سزای داگیرساوی دۆزەخ ، هەرپەیڕەوی دەکەن ؟!
لەئایەتی دووەمیش دا دەفەرموێ ( وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنْزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لا يَعْقِلُونَ شَيْئاً وَلا يَهْتَدُونَ) (البقرة:١٧٠) واتە/ ئەگەر بەو خەڵکە نادانە بوترێت : شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەون کە لەلایەن خواوە ڕەوانە کراوە، دەڵێن: نەخێر ، هەرشوێنی ئەوە دەکەوین کە باووباپیرانمان پێوەی ئالوودەبوون ولەسەری ڕاهاتوون، ئایا ئەگەر باووباپیرانیشیان تێ نەگەیشتوو هیچ نەزان بن و هیدایەت وەرنەگرن ، هەردوایان دەکەون ؟؟!... لەجاری یەکەمدا هێرشی تیانیە بۆ سەر باوك وباپیریان چونکە لەمەککە ئەوە زیاتر قورس دەکەوتەوە لەسەریان ولەسەر باووباپیریان لاریان نەبوو خۆ بەکوشت دان ، بەڵام لەمەدینە شەڕ هەڵگیرسابوو ، جائیتر هێرش دەکاتە سەر باووباپیرانیان کەعەقڵیان نەبووەو هیدایەتیان ورنەگرتووەو هەردوو ئایەتەکەش یەکتری تەواو دەکەن وجەخت دەکەنە سەر ئەوەی کەچاولێکەری کوێرانە کارێکی نەشیاوو خراپەو ناگونجێ کەسێ بیکات کەخوا نیعمەتی عەقڵ وبیروهۆشی داوەتێ.....
**نموونەی سێیەم**/قورئان لە دە شوێن دا باسی داوای کافرەکان دەکات کە فرسەتێکی تریان بدرێتێ وبگەڕێنەوە دنیا تاچاکە بکەن ، جا هەر یەکەیان تەواوکەری ئەوانی ترەوماناو مەبەستێك پیشان دەدات کە جیاوازە لەوانی تر :
**یەکەم**/لەسەرەمەرگداکافرەکان دەڵێن : ( حتى اذا جاء احدهم الموت قال رب ارجعون لعلى اعمل صالحا فيما تركت كلا انها كلمة هو قائلها ومن ورائهم برزخ الى يوم يبعثون ) المؤمنون ١٠٠ واتە/ئەوکاتەیمردن دێت ویەخە بەیەکێکیان دەگرێت دەڵێت : پەروەردگار بمگێڕەرەوە بۆ دنیا بەڵکو چاکە بکەم وئەو هەلانەی لەدەستم چووە لەمەودوا لە دەستی نەدەم ، پێ ی

دەوترێت:نەخێرئەوە قسەیەکە ئەو بۆخۆی دەیڵێت ، بەڵکودەبێت لەجیهانی بەرزەخدا لەنێوان مردن وزیندووبونەوەداچاوەڕێ بێت ..

**دووەم**/دوای زیندووبونەوەوحەشر، کافران بەکۆمەڵ بەزەلیلی ودامـاوی‌و سەرشۆڕی دەڵێن : پەروەردگارا بینیمان ، بیستمان ، بمانگێڕەوە تاچاکە بکەین ئێمە بەڕاستی ئێستادڵنیاین ( ولو ترى اذ المجرمون ناكسوا رؤوسهم عند ربهم ، ربنا ابصرنا وسمعنا فارجعنا نعمل صالحا انا موقنون )السجده/١٢

**سێیەم** / کاتێ سزاکە دەبینن لە دڵی خۆیاندا دەڵێن: ئاخۆ ڕێگا چارەمان هەبێ وبگەڕێینەوە بۆدنیا (وترى الظالمين لما راوا العذاب يقولون هل الى مرد من سبيل ، وتراهم يُعرضون عليها خاشعين من الذل ينظرون من طَرف خفي وقال الذين امنوا ان الخاسرين الذين خسروا انفسهم واهليهم يوم القيامة الا ان الظالمين في عذاب مقيم ) شورى/ ٤٥..

واتە/ سەرەنجام تاوانباران دەبینیت دەبرێنە سەر دۆزەخ ، هەموو پەست و زەلیل ولارەمل وخەجاڵەتن ، لە شەرمەزاری وترسدا لەژێرەوە بەتیلەی چاو دەڕوانن بۆ ئاگرەکە ، ئا لەو کاتە ناهەموارو ناخۆشەدا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن:بەڕاستی‌خەسارەتمەندو زەرەرمەندان ئەمڕۆ ئەوانەن کەخۆیان وکەس وکارو ماڵ ومنداڵیان لەدەستداوە لە قیامەتدا،(واتە:ئەگەر کەس وکاریان لەبەهەشت بێ بەمان چی؟!وە ئەگەر لە دۆزەخیشدا بن ئەوا کەس فریای کەس ناکەوێ، کەواتە کەس وکاریان لە دەستدا) بەڕاستی ستەمکاران لە ئازارونەشکەنجەی بەردەوامدان ..

**چوارەم**/ ئنجا کافران دەگەڕێن بەدوای تکاکارو شەفاعەتکارێکدا بەڵکو لێخۆش بوون یان گەڕانەوەیان بۆ مسۆگەر بکات (هَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُ يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُ يَقُولُ الَّذِينَ نَسُوهُ مِنْ قَبْلُ قَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ فَهَلْ لَنَا مِنْ شُفَعَاءَ فَيَشْفَعُوا لَنَا أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ قَدْ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ وَضَلَّ

عَنْـهُمْ مَـا كَـانُوا يَفْـتَرُونَ) (لأعـراف:٥٣) واتـه/ ئايابىٚباوەڕان چاوەڕىٚى چىدەكەن جگە لەپێشهاتن وڕوودانى هەڕەشە قورئانىيەكان؟ جا ئەو ڕۆژەى كە هەڕەشەو بەڵێنەكان دێنە دى، ئەوانەى پێشتر فەرامۆشيان كردبوو دەڵێن: بەڕاستى پێغەمبەرانى پەروەردگارمان هەقيقەت وڕاستىيان هێنابوو، ئەرىٚ ئەوە كەسێك نىيە تكامان بۆ بكات؟ بەڵكو خوا بمانبەخشێت ياخود بگەڕێينەوە بۆ دنياو كارو كردەوەى چاك بكەين ، نەك ئەوەى كە ئەوسا دەمانكرد، بەڕاستى ئەوانە خۆيان دۆڕاندو هەرچيان هەڵبەستبوو وباوەڕيان پىٚى هەبوو، لێيان ون بوو...

پێنجەم/ ئنجا كە دەچنە لاى ئاگرەكەوەو سەرەنجاميان دەبينن وهەوڵەكانيان بۆ گەڕانەوە سوودى نابێت ، داواناكەن ، بەڵكو خۆزگە بەگەڕانەوە دەخوازن ( (وَلَوْ تَرَى إِذْ وُقِفُوا عَلَى النَّارِ فَقَالُوا يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلا نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، بَلْ بَدَا لَهُمْ مَا كَانُوا يُخْفُونَ مِنْ قَبْلُ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ) (الأنعام:٢٧-٢٨) واتە/ئەگەر ئەوانە ببينى لەقيامەتدا لەسەرليٚوارى دۆزەخ ڕاوەستێنراون ودەڵێن:خۆزگە جارێكى تر بيانگێڕايناىەتەوە بۆ دنيا، ئەوسا هەرگيز نيشانەو بەڵگەو ئايەتەكانى خوامان بەدرۆ نەدەزانى ولە بڕواداران دەبوين، نەخێر ڕاست ناكەن بڕوا ناهێنن، بێگومان ئەوە ئاواتێكى ئەستەمە ، هەموو ئەو كارو كردەوەو پيلانانەى كەپێشتر دەيانشاردوە، ئێستا وائاشكرا بووە بۆيان، خۆ ئەگەر بگێڕدرێنەوە بۆ دنيا ، دەست دەكەنەوە بەو كارو كردەوانەى كەجاران دەيانكرد، بەڕاستى ئەوانە درۆزنن .

شەشەم/ پاش ئەوەى دەچنە دۆزەخەوەو سزا دەچێژن ودەزانن خواى گەورە وەعدى خۆى بردە سەرو سزاى دان، ئينجا داوا دەكەنەوە ، بەڵكو ڕىٚيان بدرىٚ بگەڕێنەوە دونياو دەڵێن ( وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ فِي

جَهَنَّمَ خَالِدُونَ، تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ النَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ ، أَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَى عَلَيْكُمْ فَكُنْتُمْ بِهَا تُكَذِّبُونَ,قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْماً ضَالِّينَ ، رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ، قَالَ اخْسَأُوا فِيهَا وَلا تُكَلِّمُونِ) (المؤمنون:١٠٨)
واته/ئەو کەسەی تەرازووی چاکەکانی سووك بێت، ئەوانە ئەو کەسانەن خۆیان لەدەست داوەو خۆیان خەسارو ڕیسوا کردووە، دەبێت هەر لەناو دۆزەخدا ژیانی نەبڕاوە ببەنە سەر، بڵێسەی ئاگر دەم وچاویان دەبرژێنێت، هەموویان دەم وچاویان دەشێوێت ،( ئەوسا خواوەند پرسیاریان لێدەکات)ئایا کاتی خۆی ئایەتەکانی من بەسەرتاندا نەدەخوێندرایەوە، کەچی ئێوە بڕواتان پێنەبوو وبەدرۆتان دەزانی؟ سەرەنجام بەکەساسییەوە دەڵێن: پەروەردگارا نەگبەتی ونەهامەتی شانی گرتین و زاڵ بوو بە سەرماندا، ئێمە کەسانێکی گومڕا بووین، پەروەردگارا لە ناو ئاگری دۆزەخ وَسزاکەی دەرمان بهێنە ئەگەر جارێکی تر گەڕاینەوە بۆ گومڕایی ئەوە ئیتر دیارە ئێمە کەسانێکی ستەمکارین ، خوای گەورە لەوەلامیان دا دەفەرموێت: بێدەنگ بن ودەمتان داخەن ، قسەشم لەگەڵ مەکەن... .........
هەوتەم/ ئنجا کە لەوەش بێهیوا دەبن ، وادەزانن بەهاوارهاوارو دەنگە دەنگ ڕەحمیان پێدەکرێ وسزایان سووك دەکرێ ودەگێڕدرێنەوە بۆ دنیا ، دیارە ئەمەش هەر سوودی نابێت ( وَالَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لا يُقْضَى عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَلا يُخَفَّفُ عَنْهُمْ مِنْ عَذَابِهَا كَذَلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ، وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَا أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَالِحاً غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُمْ مَا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَنْ تَذَكَّرَ وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ فَذُوقُوا فَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ نَصِيرٍ) (فاطر:٣٧) واتە/ ئەوانەی کافرو بێبڕوابوون ، دۆزەخ بۆیان ئامادەیە ، بڕیاری لەناوچوونیان نادرێت ، تابمرن ورزگاریان ببێت ! تەنانەت بەشێك لەسزاكەش لەسەریان كەم ناكرێتەوە، ئا بەوشێوەیە هەموو كافرو بێباوەڕە سەرسەختەكان سزا دەدرێن

وتۆڵـەیان لێدەستێنین . ئەوانـە گریـەو زاریوهـاوارو قیـژەو ناڵـەیان لـەناو دۆزەخدا لێبەرز دەبێتەوەو بەکەساسی یەوە دەڵێن: پەروەردگارا دەرمان بهێنـەو ڕزگارمان بکە لەم حاڵە، مەرج بێت کارو کردەوەی چاك ئەنجام بدەیـن، نـەك ئەوەی کەجاران دەمانکرد، لـە وەڵامیاندا خواوەند دەفـەرموێت : ئایائـەوەنده تەمەنمان پێنەبەخشین، ئەوەی بیەوێت بیری بکاتەوە تیایدا بیربکاتەوە؟!
بێدارکەرەوەشتان بۆ هات،( دیارە هەموو خەجاڵەت وسەر شۆڕ دەبن وقسەیان نامێنێت) بۆیە پێیان دەوترێت: کەواتە دەبچێژن سزای سەختی دۆزەخ، چونکە ستەمکاران هیچ پشتیوانێکیان نی‌یە ...
**هەشتەم/** سزاوئازاریدۆزەخ کافران بێزار دەکات وهیچ چارەیان نامێنێ تەنها ئەوە نەبێت کە داوا دەکەن تاقە ڕۆژێـك بەشـێك لـە سـزاکەیان لەسـەر سـووك بکرێت، دیارە بۆ ئەمەش وەڵامیان نادرێتەوە :( وَقَالَ الَّذِينَ فِي النَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ادْعُوا رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْماً مِنَ الْعَذَابِ، قَالُوا أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُمْ بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا بَلَى قَالُوا فَادْعُوا وَمَا دُعَاءُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ) (غافر:٤٩)
واتـە/ئەوانـەی کەلـەناو ئـاگری دۆزەخـدان بەفریشـتەکانی کـارگێڕی دۆزەخ دەڵێن:داوا لە پەروەردگارتان بکەن، تەنها ڕۆژێك بەشێك لەسزاو ئازارمان کەم بکاتەوە.. ئـەوانیش لـە وەڵامیـان دا دەڵێـن:باشـە مەگـەر پێغەمبـەرەکانتان بـە بەڵگەو نیشانەی ڕوون وئاشکراوە ، ڕەوانە نەکرابوون بۆتان؟ هەمووان دەڵێـن : بەڵێ، ڕاستە، ئنجا فریشتەکان دەڵێن: دەی کەوابوو هەر داوابکەن وبپاڕێنەوە، بێگومان داخـوازی وپاڕانـەوەی کـافران بـەهیچ ناچێت ، تـازە هیـچ نرخێکـی نیەوگیرا نابێت...
**نۆیەم/** کاتێ بێ هیوا دەبن لە دەرچوون لە دۆزەخ وکەم کردنەوەی سزاکەی ، ئنجا داوادەکەن لە کـارگێڕانی دۆزەخ ، کـە داوا بکـەن لـەخوا کـە بەیـەکجاری لەناویان بەرێت:( إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَالِدُونَ ، لا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ

مُبْلِسُونَ، وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا هُمُ الظَّالِمِينَ ، وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُمْ مَاكِثُون ، لَقَدْ جِئْنَاكُمْ بِالْحَقِّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ) (الزخـرف:٧٨)واتـه/ بەڕاستی تاوانباران لـەناوئازارو سـزای دۆزەخ دا بەهەمیشـەیی دەمێننـەوە،ئازارو سزا لەسـەریان کـەم ناکرێتـەوە، لـەکاتێکدا هەمووشیان تیایدا نائومێدو بێهیوان.

جاوەنـەبێت ئێمـە ستـەممان لێکردبـن، بـەڵکو هـەرخۆیان ستـەمکار بـوون، دۆزەخیـەکان هـاوار دەکـەن، ئـەی مـالیك( کەفریشـتەی سەرپەرشـتیارە):باپـەروەردگارت بمـانکوژێت، دەبـا بمریـن وکۆتـایی بـەم سەغڵەتی‌یەمان بێت، لەوەڵامیاندا دەڵێت: بەڕاستی ئەوە جێتانەو تیایدا بۆ هەمیشـە دەبێـت بمێننـەوە، سـوێند بـەخوا بەڕاسـتی ئێمـە پـەیامی هـەق وڕاستیمان بۆ ئێوە ڕەوانە کـردووە، کـەچی زۆربـەتان حـەزتان لەحـەق وڕاستی نیەو لێی بێزارن..

**دەیەم/** کافرەکـان هـەرکات سـەیری کـارو کـردەوەی بـەدیان دەکـەن ودەزانـن هەرچی وەعدو پەیمان وقسەی پێغەمبەرانە ڕاست دەرچوون ، ئاوات دەخوازن کەخۆزگە پاش زیندوکردنەوە ببونایەتـەوە بە گڵ وتیابچونایەتەوە، یان هـەر زینـدوو نەکرانایەتـەوەو هـەر نەبوونایـە...جائەمـە لـە دوای هـەمووبێ هیـوا بوونەکانیان بێت، یان لەگەڵ هەموو قۆناغێك کەپێشتر باسمان کرد بیڵێن هەر دەگونجێ( يَوْمَ يَنْظُرُ الْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنْتُ تُرَاباً) (النبـأ:٤٠) واتـە/ قیامـەت ڕۆژێکە کە ئادەمیزاد سـەیری کردەوەکـانی دەکـات کەپێشتر کردوونی ، خوانەناس دەڵێت: خۆزگە هەر خاك بوومایەو ئاوا زیندوو نەکرامایەتەوەو گیرم نەخواردایە...

**نموونـەی چـوارەم/** ڕتمان پـەیوەندی هەیـە لـە نێـوان ئایـەتی سـورەتێك وئایەتی‌سـورەتی تـردا کـە لـە سـەر یـەك مەسـەلە هـاتوون ، ئـەوەتا لەمەککـە

فەرمانێك هاتووە بۆ حەزرەت(ص)کە دوور بکەوێتەوە لە کۆڕو کۆمەڵی ئەوانەی کە سووکایەتی ئەکەن بە ئایەتەکانی خوا ، پاشان لە مەدینەش جەخت دەکاتەوەسەر ئەم مەسەلەیە وئاماژە دەکاتەوە بۆ فەرمانەکەی کە لەمەککە ناردبوویە خوارێ....

خوای پەروەردگار لە مەککە لە سورەتی(الانعام/٦٨)دا فەرمان ئەدات بە حەزرەت(ص) و دەفەرموێت ( وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنْسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ) (الأنعام:٦٨)
واتە/کاتێك ئەوانەت بینی کە سوکایەتی بەئایەتەکانی ئێمە دەکەن، ئەوا پشتیان تێبکە وکۆڕو کۆبونەوەیان بەجێبهێڵە هەتا ئەو کاتەی دەچنە سەر باسێکی تر، کاتێکیش ئەگەر شەیتان لە بیری بردیتەوە کە دوور بکەویتەوە لێیان، هەر ئەوەندەی بیرت کەوتەوە لەگەڵ گەلی ستەمکاراندا دامەنیشە..
لەشاری مەدینەش دووڕووەکان بەڕووکەش موسڵمان بوون ولەدڵیشەوە دژی بەرنامەی خوا بوون ، بۆیە هەر فرسەتێکیان بۆ هەڵکەوتایە تانەو تەشەریان ئەدا لەموسڵمانان وژەهری خۆیان دەڕشت.. بۆیە جارێکی تر لەباسی دووڕووەکاندا جڵەو گیری کرد لەدانیشتن لەکۆڕو کۆمەڵی ئەوانەی کە سووکایەتی بە بەرنامەی خوا دەکەن وئاماژەشی بۆفەرمانە پێشترەکەی مەککەش کردو، فەرمووی ( بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَاباً أَلِيماً الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ أَيَبْتَغُونَ عِنْدَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعاً وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذاً مِثْلُهُمْ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعاً) (النساء:١٤٠)

واتە : ئەی پێغەمبەر(ص)مژدە بەدووڕووەکان بدە کە بەڕاستیسزایەکی بە ئێشیان بۆ ئامادە کراوە ، ئەو دووڕووانەی کە بێباوەڕەکان دەکەنە پشتیوان

وياوەری خۆیان لەجیاتی بڕواداران ، ئایا دەیانەوێت دەسەلاَت وسەربەرزیان لەلای ئـەوان دەست بکـەوێت ؟ ئەوانـە بـە هەڵـە داچـوون ، چونکـە بەڕاسـتی دەسەلاَت وبالاَدەستی وسـەربەرزی هـەر هـەمووی بۆ خوایـە، بەڕاسـتی خـوای گـەورە لـە قورئـاندا ئـەم بڕیـارەی پێشـتر نـاردووە بـۆ سـەرتان ،(مەبەسـت فەرمانەکەی مەککەیـە)کە هـەرکاتێك لەجیٚیەکدا گوێتان لیٚبوو کوفرو گاڵتـە بـە ئایەتەکانی خوا دەکرا، ئەوە دامەنیشن لەگەڵ ئەوانـەدا هـەتا قسـەو باسـەکەیان ئـەگۆڕن ، ئەگەردانیشـن وگـویٚ نـەدەنیٚ ئـەوە بەڕاستی ئێـوەش لەوکاتـەدا وەك ئەوانن وحیسابیئەوانتان بۆ دەکریٚ ، بەڕاسـتی خـوا دووڕووەکان وبێباوەڕان هـەموویان لـەدۆزەخ دا کـۆ دەکاتـەوە.. ئـەم ئایەتانـەی (النسـاء) لۆمـەی ئەوانـە دەکات کە بە گـویٚی فەرمانەکـەی پێشـویان نـەکردووە کـە هـەرزوو لەمەککـە هاتۆتـە خـوارەوەو پاشـان زیاتر ڕوونـی دەکاتـەوە کـە نابیٚ دۆسـتایەتی بکـریٚ لەگەڵ ئەوانەی کە دژایەتی ئیسلام دەکەن وگاڵتـەی پێدەکەن، ئینجا ئەوانـەش کـەوا دەکـەن وگـویٚ نـادەنیٚ بـەدووڕوویان دائـەنیٚو هەڕەشـەی دۆزەخیشـیان لیٚ دەکات .. لێرەوە پەیوەندی نێوان ئەو دووفەرمانـە تێدەگەین کـە قورئـان خـۆی ئاماژەی بۆ دەکات ..

**نموونەی پێنجەم** :قورئان ڕێنمایی بڕواداران دەکات کە تەنها لەخوا داوای عیززەت و سەربەرزی بکەن ، چونکـە هـەرچی عیززەت و دەسـەلاَتە هـی خوایـە ولای ئـەوەوە دەسـت دەکـەوێت ..ئـەم مەسـەلەیە لـە شـەش سـوورەتدا هـاتووە وهەموویان پێکەوە هەموو لایەنەکانی روون دەکەنـەوە و هـەریەکەشیان بەتەنـها ڕۆڵی خۆی بینیوە لەو سوورەتەدا کە تیایدا هاتووە ..

**یەکـەم** :لەمەککـە یەکـەم جـار لەسـەر ئـەم مەسـەلەیە ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارەوە: (من كان يريد العزة فلله العزة جميعا ، اليه يصعد الكلم الطيب والعمل الصالح يرفعه والذين يمكرون السيئات لهم عذاب شديد ومكر اولئك هو

يبور ) فاطر ١٠ واته : ئەوەی سەربەرزی وپایە بڵندی دەوێت ، بابزانێت کە هەموو سەربەرزیو پایە بڵندیەك هەر بۆ خوایە ، گوفتاری جوان وبەجێ بۆلای ئەو بەرزدەبێتەوە ، کارو کردەوەی چاکیش گوفتاری شیرین بەرزدەکاتەوە ، جا ئەوانەی کە پیلانی خراپ دەگێڕن سزای زۆر توندو تیژ بۆیان ئامادەیە ، پیلانی ئەوانە هەر خۆی پووچ دەبێتەوەو بێ بەروبووم وبێئاکامە ..

**دووەم** :هەر لەمەککە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ( واتخذوا من دون الله الهة ليكونوا لهم عزا ، كلا سيكفرون بعبادتهم ويكونون عليهم ضدا ) مريم ٨٢

واتە :ئەو بێباوەڕانە لەجیاتی خوا جۆرەها شتی تریان کردوۆتەخوای خۆیان تا پایەداری و دەسەڵاتیان دەست بکەوێت ..نەخێر ، ئەو شتانەی ئەوان دەیپەرستن لەڕۆژی قیامەت دا باوەڕیان بەپەرستنیان نیەو ناڕەزایی دەردەبڕن، بەڵکو بەسەختی دژایەتییاندەکەن وبەرپەرچیان ئەدەنەوە ..

**سێیەم**: هەر لە مەککە لە سورەتی یونس ئایەتی(٦٥)دا قورئان هاتەوە سەرئەم باسەو بە حەزرەتی فەرموو: هەرچەندە کافرەکان پڕوپاگەندە دەکەن وپیلان دەگێڕن، تۆ گوێیان مەدەرێ و بزانە کە هەموو عیززەت و گەورەیی ودەسەڵاتێك هی خوایەو ئەویش بیسەرو زانایە ( وَلا يَحْزُنْكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعاً هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) (يونس:٦٥) دیارە ئەم ئایەتە پەیوەندی پتەوی هەیە بەئایەتەکانی تری سورەتی(یونس)ەوە لە هەمان کاتیش دا، باسەکانی تری مەسەلەی(عیززەت)تەواو دەکات...

**چوارەم**: هەر لەمەککە سورەتی(صافات) هاتە خوارەوە پێغەمبەری(ص) دڵنیا کرد کە سەرکەوتن هەر بۆ پەیام وبەرنامەی خواو پێغەمبەرانێتی ، چونکە خوای پەروەردگار( رَبُّ العزَّة)ە و، فەرمووی ( وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ ، إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنْصُورُونَ ، وَإِنَّ جُنْدَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ، فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّى حِينٍ ، وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ، أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ، فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ

فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ ، وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّى حِينٍ ، وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ، سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ، وسلامٌ على المرسلين ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) (الصافات:١٧١-١٨٢) **واتە:سوێند بەخوا بێگومان بڕیاری ئێمە بۆ بەندە فرستادە وپێغەمبەرەكانمان (هەر زوو دەرچووە) كە بەدڵنیایی، هەر ئەوان سەركەوتوو سەرفراز دەبن، سەربازە ئیماندارەكانیشمان هەر دەسەڵات دەگرنە دەست وزاڵ دەبن، جارێ تاماوەیەك خۆت بگرە وگوێیان پێمەدە ، تۆ سەرەنجامی لاری وخوانەناسیان بخەرە بەرچاو، لە ئایندەدا خۆیان دەبیننەوە...ئایا ئەوانە پەلەیانە كە زوو سزاو تۆڵەی ئێمە ڕووبەڕوویان ببێتەوە ویەخەیان پێبگرێت؟!(خاك بەدامانیان)،كاتێك كە سزاو تۆڵەی ئێمە دادەبەزێتە مەیدانیان ، ئای كە بەرەبەیانێكی سامناكە بۆ ئەوانەی كە ئینزار كراون لە سزای خواو گوێیان پێنەداوە... تۆ تاماوەیەك مۆڵەتیان بدەو گوێیان پێمەدەو، ڕاستییەكان بخەرە بەرچاو، سەرەنجام خۆیان دەبیننەوە،پاكی وبێگەردی بۆ پەروەردگارت،پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات وعیززەت، لەوەی كە ئەوانە دەیدەنە پاڵ ئەو زاتە بێهاوەڵ وهاوتایە.. سڵاو درودیش لەسەر هەموو پێغەمبەران وسەرجەم فرستادەكانی خوا ، سوپاس و ستایشیش هی خوای پەروەردگاری هەموو جیهانە.**

**پێنجەم : لەمەدینەش لە سورەتی (النساء) دا، باسی دووڕووە كان دەكات كە دۆستایەتی جولەكەو كافرانیان دەكرد بەمەبەستی ئەوەی كە نەوەك ڕۆژێك بكەونە تەنگانەوەو كەس نەبێت فریایان بكەوێت.. قورئان دەفەرموێت**(بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَاباً أَلِيماً،الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ أَيَبْتَغُونَ عِنْدَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعاً) (النساء: ١٣٨-١٣٩) **واتە:ئەی پێغەمبەر(ص) مژدە بدە بە دووڕووەكان كە بەڕاستی سزایەكی بەسوێیان بۆ ئامادەكراوە، ئەوانەی كە بێباوەڕان دەكەنە پشتیوان ویارو یاوەری خۆیان**

لەجیاتی بڕواداران ، ئایا دەیانەوێت عیززەت ودەسەلأت و سەربەرزیان لای ئەوان دەست بکەوێت؟ ئەوانە بە هەڵەداچوون،چونکە بەڕاستیعیززەت وبالأدەستی هەرهەمووی هی خوایەو ئەو دەیبەخشێ، بە هەر کەسێ کە بڕواداروشایستە بێت.

**شەشەم**: پاش لێبوونەوە لەغەزای بەنیموستەلەق ، پێغەمبەر(ص) لەسەر ئاوێك خێوەتی هەڵداوخەڵك هاتن بۆ ئاو بردن ، عومەری کوڕی خەتتاب کابرایەکی کرێگرتەی لە گەڵدابوو ناوی(جهجاه)یغەفاری بوو، ئەم پیاوە لەسەر ئاوەکە لەگەڵ(سنان)ی کوڕی(وبر)ی(جهنی)دا بوو بەدەمەقاڵێیان وشەڕ دروست بوو، کابرای (جهنی)هاواری کردە ئەنسارییەکان ، (جهجاه) یش هاواری کردە کۆچەران ، خەریك بوو مەسەلەکە گەورە بێت، پێغەمبەر(ص)پێی فەرموون: ئایا بانگەشە بەدروشمی جاهیلی دەکەن، لەکاتێك دا هێشتا من لەناوتاندام ؟ وازی لێبهێنن ئەمە بۆگەن وخراپە..

ئەم هەواڵە گەیشتەوە بە(عبدالله)ی کوڕی (ئوبەی) کوڕی سەلول سەرکردەی دووڕووەکان، ئەویش لەناو خزمانیدا خۆی تورەکردو وتی:ئەمەشیان کرد؟ هاتنە سەرمان ومالٚ وحاڵیان لێداگیر کردین ، وەڵلاهی ئێمەو ئەوان وەك ئەوە وایە کە وتراوە: سەگەکەت تێر بکە بابتخوات ، بەخوا کە گەڕاینەوە بۆ مەدینە دەبێت ڕێزدارەکەمان بێڕێزەکەمان شاربەدەر بکات.. پاشان ڕووی کردە ئەوانەی دەوروبەری وپێی وتن:دەبخۆن دەی ، ئەمە خۆتان بەخۆتان کرد، هێناتانن بۆسەر خاك وئاوی خۆتان و،ماڵتان لەگەڵ بەشکردن ، بەخوا ئەگەر نانیان نەدەنێ لەوێ باردەکەن ودەڕۆن..

هەر دەم ودەست زەیدی کوڕیئەرقەم کە کوڕێکی مێرد منداڵبوو لەوێدا دانیشتبوو، ئەم قسەیەی گەیاندە خزمەت پێغەمبەر(ص)وئەویش خەڵکەکەی

سەرقاڵکرد بەڕۆیشتنەوەو کە تەواو ماندوو بوون ولایان دا بۆ پشوودان هەموو لەماندوێتیدا خەویان لێکەوت، ئەمەش بۆئەوەی فریای قسەو باس نەکەون وکێشەکە کپ ببێتەوە.. ئینجا کەعبداللە ی کوڕی ئوبەی زانی زەید قسەکەی گەیاندووە هات وسوێندی خوارد کە شتی وای نەوتووە..ئینجا قورئان هاتە خوارەوە وڕاستی‌یەکانی ئاشکرا کرد لەسورەتی(المنافقون) دا کە دەفەرموێ(هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لا تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لا يَفْقَهُونَ، يَقُولُونَ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لا يَعْلَمُونَ) (المنافقون:٧-٨) واتە/دووڕووەکان دەڵێن بەخەڵکی: ماڵ وسامان مەبەخشن بەو کەسانەی کە لە دەوری پێغەمبەری‌خودادان ، تابلاوەی لێ‌بکەن! ئەی نازانن هەرچی گەنجینەکان هەیە لە ئاسمان و زەوی دا هەر خوا خاوەنیانە، بەڵام دووڕووەکان ئەم ڕاستی یە تێ‌ناگەن..ئەو دووڕوانە دەڵێن: سوێند بەخوا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە، دەبێت ئەوەی کە دەسەڵاتدارو بەڕێزوپیاو ماقووڵە، ئەوە دەر بکات لەشار کە بێ‌ڕێزو بێ‌دەسەڵاتە، هەرچی عیززەت ودەسەڵات وپایەداری یە هی‌خواو پێغەمبەرەکەی وبڕوادارانە، هەرچەند دووڕووەکان ئەم ڕاستی‌یە نازانن ،یان خۆیانی لێ‌هەڵە دەکەن.. دیارە ئەم چەند ئایەتە لە سورەتی (المنافقون) دا،کەهەمووی‌باس لەدووڕوویی دەکات،جی‌ی خۆی گرتووە ، بەڵام لاپەڕەیەکی ترە لەباسی(عیززەت)دا ئەگەرببیخەینە پاڵ باسەکانی تر لەم مەسەلەیەدا..

جا بۆ ئەوەی بەچاکی لەهەموو لایەنەکانی هەر مەسەلەیەك تێبگەین ،چاك وایە چی ئایەتێك هەیە لەو بارەیەوە کۆی بکەینەوەو لێی وردبینەوە تاباشتر بەرچاومان ڕوون ببێت وسەرمان لێ نەشێوێت !

...

**نموونەی شەشەم/** خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

ا-یُرِیدُونَ لِیُطفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأفوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ ولَوْ کَرِهَ الکَافِرُونَ،هُوَ الَّذِي أرْسَلَ رَسُولَهُ بِالهُدَى وَدِینِ الحَقِّ لِیُظهِرَهُ عَلَى الدِّینِ کُلِّهِ ولَوْ کَرِهَ المُشرِکُونَ) (الصف:٩) واتە/ئەوانە دەیانەوێت: هۆکاری تایبەتیان دەست بکەوێت، تا بتوانن نووری خوا بەفوو، بەقاڵەی دەم بکوژێننەوە ا خوا نووری خۆی، ئاینی خۆی تەواو دەکات ودەیچەسپێنێت هەرچەندە کافرو بێبڕواکان پێی سەغڵەت بن وپێیان ناخۆش بێت ...( لێرەدا بەدوای هۆکاردا دەگەڕێت تاوەکو بیکوژێننەوە، خواش دەفەرموێ نووری خۆم تەواو دەکەم)

ب-(یُرِیدُونَ أنْ یُطفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأفوَاهِهِمْ وَیَأبَى اللَّهُ إلَّا أنْ یُتِمَّ نُورَهُ ولَوْ کَرِهَ الکَافِرُونَ ،هُوَ الَّذِي أرْسَلَ رَسُولَهُ بِالهُدَى وَدِینِ الحَقِّ لِیُظهِرَهُ عَلَى الدِّینِ کُلِّهِ ولَوْ کَرِهَ المُشرِکُونَ) (التوبة:٣٣) واتە/ (ئالێرەدا لەوە دەچێت هۆکارەکانیان دەست کەوتبێت وخۆیان کۆکردبێتەوە ، ئینجا دەیانەوێت نوورو ئاینی خوا بەفوو، یان بەقاڵەی دەم بکوژێننەوە، (بەڵام خەیاڵیان خاوە) خوا ناهێڵێت ئاواتەکانیان بێتە دی و(یأبى الله الآ أن یتم نوره) هیچ شتێکی تری ناوێ جگە لەوە نەبێت ئاین ونووری خۆی سەربخات وتەواوی بکات، هەرچەندە کافرانیش پێی سەغڵەت ودڵتەنگ بن، هەر ئەو زاتە بۆیە پێغەمبەرەکەی هاوڕێ لەگەڵ، هیدایەت وڕێنموویی وئاینی ڕاست ودروست دا ڕەوانە کردووە تا سەری بخات بەسەر هەموو بەرنامەو ئاینەکانی تردا، هەرچەندە موشریکەکانیش سەغڵەت وناڕەحەت بن.

( وەك وتمان: ئەمجارە زیاتر کاری کافران پەرەی پێدراوەو یەکسەر ئەیانەوێ دینەکە بکوژێننەوە بۆیە دەفەرموێ( ویأبى‌الله الا أن یتم نوره) بەڵام لە حاڵەتەکەی یەکەمدا کە خۆیان ئامادە دەکەن و دەیانەوێ هۆکار بەدەست

بهێنن (ليطفئوا) تا بيكوژێننەوە فەرمووی( والله متم نوره ) کەواتە لێرەدا ئەم دووبارە کردنەوەیە باس لەدووقۆناغی هەوڵی کافران دەکات..

**نموونەی حەوتەم/**

أ-( هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا )(الأعراف ١٨٩ ) واتە/ خوا ئەو زاتەیە کەئێوەی لەیەك نەفس دروستکردووەو هەر لەویش جووتەکەی بەدی هێنا، بۆ ئەوەی ئارامی لەلا بگرێت..( لێرەدا باس باسی ئارامی‌یەو(واو العطف)ی بۆ بەکاردێنێ) بەڵام لەم ئایەتەی‌ترداباس لەوە دەکات کە ئادەم ماوەیەك بەتەنها بووە لە بەهەشتداو پاشان(ثم) خوای گەورە حەوای هەر لەخۆی دروستکردووە ..

ب-( خلقكم من نفس واحدة ثم جعل منها زوجها) الزمر٦/ واتە: ئێوەی لەیەك نەفسەوە دروستکردووە پاشان هاوسەری لەو نەفسەوە بۆ دروستکرد... ( کەواتە ئەم دووئایەتە بەهۆی(واو)ی(العطف)و(ثم)ەوە جیاوازن هەریەکەیان مانایەکی تایبەتی هەیە).....

**نموونەی هەشتەم/** لە مەدینە لەسوورەتی(البقرە) ئایەتی(٢٢٥)دا قورئان دەفەرموێت:(لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ) (البقرة:٢٢٥) واتە/ خوای گەورە ئەو سوێندانەتان لێناگرێت کە لە دەمتان دەردەچێت ولەسەری ڕاهاتوون، بەڵکو ئەوەتان لێ دەگرێت کە نیەتی دڵتانی لەسەرەو خوا لێخۆشبووەو ئارامگرو خۆڕاگرە...

پاشان خوای گەورە لەکۆتایی مەدینەدا لەسوورەتی(مائدە) ئایەتی(٨٩)دائەم حوکمەی زیاتر ڕوونکردەوەو ئایەتەکەی پێشووی تەواو کرد بەوەی کە فەرمووی (لا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمُ الْأَيْمَانَ (المائدة:٨٩)

واتە/ خوالێتان ناگرێت کاتێك بەسادەیی سوێند بەدەمانتندا دێت ، لەو سوێندانەتان دەپرسێتەوە کەبیروهۆشتان لای بووەو بۆ مەبەستێك وتووتانە وجەخت کراوەتەوە سەری، ئەوەش کەفارەتەکەی ( فَكَفَّارَتُهُ) :

أ-( لا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمُ الْأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ (المائدة:٨٩) ....

واتە/ نان وخۆراك دان بەدەکەسی هەژار بەشێوەیەکی مام ناوەندی کەبۆ خاوو خێزانتان سەرفی دەکەن....

ب-أو كسوتهم... یاخود پۆشتە کردنەوەیان

ج- أوتحريرُ رقبة... یاخود ئازادکردنی بەندەیەك ئەگەر بووی...

ئەوەی توانای ئەوانەشی نەبوو ئەوا ( فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ )باسیٚ ڕۆژ بەڕۆژووبێت...

( ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ )ئەوە کەفارەتی سوێندەکانتانە کاتێك سوێند دەخۆن ونایبەنە سەر( وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ )سوێندەکانتان بپارێزن وبیبەنە سەر (كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ) (المائدة:٨٩)

ئابەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە بۆ ئەوەی سوپاس گوزاری بکەن، بەڵێ... ئەم ئایەتانەی دوایی هەموو لایەنەکانی سوێند خواردنیان ڕوونکردەوە کەتەواوکاری ئەوەی پێشووە...

**بنەمای سێیەم/تەوەرەی هەرسورەتێك:**

هەر سورەتێك وەك درەختێك وایە کە بەلق وپۆپ وگەڵاکانی وێنەیەکی جوانی هەبێ وقەدەکەی هەموو لق وپۆپەکانی هەڵگرتبێ وهەموویان بەیەکەوە جۆرە درەختێکن، کە ناوێکی تایبەتی هەیە..

هەر سورەتێکی قورئان ناوێکی تایبەتی هەیەو کەسایەتی‌یەکی تایبەتی‌و تەوەرەیەك یان چەند تەوەرەیەکی هەیە کە بەدەوریا دەخولێتەوەو باسی دەکات..بۆ نموونە:

**یەکەم/** سورەتی فاتحە ، گەورەترین (أعظم) سورەتی قورئانەو پێی دەوترێت(أم الکتاب)و، لەسەرەتای قورئانەوە دانراوەوخوڵاسەی هەموو قورئانەو لەوە دەچێت هەموو سورەتەکانی دواتری ڕاڤە وشەرحی ئەوبن..حەسەنی بەسری دەڵێ((خوا هەموو زانستی پەڕاوە ئاسمانی‌یەکانی پێشووی لە قورئاندا داناوەوئنجا هەرچی زانستی قورئانیش هەیە لەفاتیحە دا دایناوە ، هەر کەس تەفسیرەکەی بزانێ وەك ئەوە وایە کە تەفسیری هەموو پەڕاوە ئاسمانی‌یەپێشینەکان بزانێت))هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەوەندە گرنگی پێدراوەو نوێژ بەبێ خوێندنی فاتیحە دروست نیە..

**دووەم/** تەوەرەی سەرەکی سورەتی (یوسف)، بەسەرهاتی(یوسف)ە سەلامی خوای لێ‌بێ‌وئنجا ناوبەناو ئامارژە دەکات بەهەندێ پەندو ئامۆژگاری، بۆنمونە دەفەرموێت ( لَقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِ آيَاتٌ لِّلسَّائِلِينَ) (یوسف:٧) واتە/ بەخوا، بێگومان لەم ڕووداوەی یوسف وبراکانیدا نیشانە وبەڵگەی زۆر هەیە بۆ کەسانێك کە پرسیار دەکەن ودەگەڕێن بەدوای ڕاستێتی پێغەمبەرێتی تۆدا.

هەروەها دەفەرموێت ( وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ آتَيْنَاهُ حُكْماً وَعِلْماً وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ) (یوسف:٢٢)

واتە/ کاتێك یوسف پێگەیشت وگەیشتە ئەوپەڕی توندو تۆڵی‌لاشەیی وژیری، ئێمەش پلەی فەرمانڕەوایی‌ودانایی وزانیاریمان پێبەخشی، هەر بەو شێوەیەش پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە ( واتە هەرکەس وەك یوسف چاکە کاربێت ، بەهەمان شێوە دێین بەهانایەوەو پایەبەرزی دنیاو ئاخیرەتی دەکەین ،چونکە ئەوە سوننەتی خوایە بۆ هەموو چاکەکارێك دووبارە دەبێتەوە)..

هەروەها دەفەرموێت ( وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا مَنْ نَشَاءُ وَلا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ، وَلَأَجْرُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ لِلَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ) (يوسف: ٥٧)

واتە : ئابەوشێوەیە دەسەڵاتمان دا بەیوسف وجێگیروپایەدارمان کرد لەخاکی میسردا ، هەر پلەو پایەیەکی دەویست لەو وولاتەدا دەستی دەکەوت وبۆی ساز دەبوو.. هەرکەسمان بوێت ئاوا بەهرەوەری دەکەین لە ڕەحمەت وبەخششەکانمان وپاداشتی چاکەکاران بەزایە نادەین، بێگومان پاداشتی ئاخیرەتیش لە بەهەشت داچاکترە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو پارێزکارن.

پاشان دە ئایەتی دوایی سورەتەکەش هەر ڕێنمایییەو پەروەردەیە بۆ موسڵمانان ، بۆ نموونە لە دوو ئایەتی دواییدا دەفەرموێت ( حَتَّى إِذَا اسْتَيْأَسَ الرُّسُلُ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا جَاءَهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّيَ مَنْ نَشَاءُ وَلا يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ ، لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثاً يُفْتَرَى وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدىً وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ) (يوسف: ١١٠) واتە / ئەی پێغەمبەر(ص) وامەزانە کە ئەم ڕێگەیە بەگوڵ وگوڵزار چێنراوە ، بەڵکو پڕە لە ناخۆشی وئازارو گەیشتۆتە ڕادەیەك کە، هەتا پێغەمبەرانیش تووشی نائومێدیوبێهیوایی دەبن و گومان وادەبەن کە
بە ڕاستی ئەوان بەرنامەکەیان بە درۆ زانراوە ، ئینجا ئا لەو کاتی بێهیواییەدا ، سەرکەوتنی تایبەتی ئێمەیان بۆ دێت ، ئەوسا ئەوەی بمانەوێت وشایستە بێت ڕزگاری دەکەین ، جا کەس نییە بتوانێت تۆڵەی توندو تیژی ئێمە لە کەسانی تاوانباروتاوانکار بگێڕێتەوەو بەرپەرچی بداتەوە.. بەخوا بەڕاستیلەسەر گوزەشتەو بەسەرهاتی پێغەمبەراندا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانی ژیرو هۆشمەند، وە نەبێت ئەم قورئانە قسەوباسێك بێت هەڵبەسترابێت، بەڵکو بەڕاست دانەری ئەوەیە کە لەپێش خۆیەوە

هاتووە(تەورات وئینجیل)و روونکەرەوە وجیاکردنەوەی هەمووشتێکی پێویستە لەئایندەدا و، ڕێنمویی و ڕەحمەتیشە بۆ کەسانێك باوەڕ دەهێنن..
**سێیەم/** تەوەرەی سەرەکیسورەتی (الرحمان)ڕەحمەت وبەخششە زۆرەکانی پەروەردگارە ، یەك بەیەك لەپێشانگای سورەتەکەدا دەیان خاتە بەرچاوو،پاش هەریەکەیان دەفەرمووێت: ئەی ئادەمیزادو پەری بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگار باوەڕ ناکەن وکامەی پەسەند ناکەن (فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ) قورئان دەفەرموێت:(الرحمان ، علّم القرآن ، خلق الإنسان ، علّمه البيان ، الشمسُ والقمر بحسبان ، والنجم والشجر يسجدان، والسماء رفعها ووضع الميزان ، والارض وضعها للأنام ، فيها فاكهةٌ والنّخلُ ذات الأكمام ، والحَبُّ ذو العصفِ والرّيحان، فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ) (١-١٣)الرحمان / واتەخوای میهرەبان، قورئانی فێری ئادەمیزاد کردووە ( کەئەمەش یەکەم ڕەحمەتەوگەورەترینیانە لەپێشانگاکەدا) ئینجا دێتە سەرئەوانی تر: هەر خوا ئادەمیزادی دروست کردوە، هەرئەویش فێری گوفتارو ئاخاوتنی کردووە... خۆرومانگیشی بەحیسابێکی وورد دروست کردووەو لەخولگەکانیاندا لەسوڕانەوەدان ، ئەستێرەو درەختەکان ، ڕووەکە بێقەدو درەختە بەرزەکان، هەموویان سوجدە دەبەن بۆ دروستکاریان ولەو نەخشەیە دەرناچن کە بۆیان دیاری کراوە ، ئاسمانیشی بەرزوبڵند کردۆتەوەو، تەرازوو پێوەری بۆ هەمووشتێك داناوە( هەموو شت بەیاسایەوهیچ شتێك بەهەڕەمەکی وبەبێهودە دروست نەکراوە بۆیە پێویستە ئادەمیزادیش بەرنامەو یاسای هەبێت لەچوارچیوەی قورئان وسوننەت دا ).. ئێوەش ئەی نەوەی ئادەم با تەرازوو پێوەرتان ڕێك وپێك بێت وستەم لەیەکتر مەکەن . دادپەروەر بن لە کێشان وپێوان داو تەرازوو بازی مەکەن وکەم فرۆشی ئەنجام مەدەن... زەویشی بۆخەڵك ڕاخستووەو باری هێناوە تاژیانی تیا بەرنەسەر ، جۆرەها میوەی تێدا

دێته بەر، هەروەها خورمای خاوەن دەفری گوڵدانی بۆفەراهەم هێناون، هەروەها جۆرەها دانەوێڵەی کاو پەلو پۆدار و بۆنخۆشی تیادا بەرهەم هێناوە... جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزادو پەری بە کام لەنازو نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕواناکەن و کامەی پەسەند ناکەن..

(خَلقَ الإنسانَ من صلصالٍ كالفخّار، وخلقَ الجانَّ من مارج من نار، فبأى آلاء ربّكما تكذّبان)

ئادەمیزادی دروست کردووە لە قوڕێکی وشك بوو، وەك فەخفوری، پەرییەکانیشی لە بڵێسەی ئاگر دروست کردووە، ئەی گرۆی ئادەمی وپەری بە کام لەنازو نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕواناکەن وپەسەندی ناکەن! (ربُّ المشرقين ورب المغربين، فبأى آلاء ربّكما تكذبان) خوا خاوەنی هەردوو خۆرهەڵات وهەردوو خۆر ئاوایە، ئەی گرۆی ئادەمی وپەری بە کام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕواناکەن وپەسەندی ناکەن!

(مرجَ البحرين يلتقان بينهما برزخٌ لايبغيان، فبأىّ آلاء ربّكما تكذّبان) ئاوی‌دوو دەریای بەیەك گەیاندووەو تێکەڵیش نابن، ئەی گرۆی پەری وئادەمی بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕواناکەن وپەسەندی ناکەن !( يَخرجُ منهما اللؤلؤ والمرجان, فبأىّآلاء ربّكما تكذّبان) لەودوو جۆرە دەریایە مرواری ومەرجان دەردەچن ، ئەی گرۆی پەری‌و ئادەمی بە کام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕواناکەن و پەسەندی ناکەن، ئیتر بەم جۆرە بەردەوام دەبێ ودوایش دێتە پاداشتی بڕواداران وبێباوەڕان ..

**چوارەم/** سورەتی(العلق)یش ئەگەر لێی وردبینەوە، باسی سەرەکی بریتی‌یە لەپێویستی مرۆڤ بەئاین وئەوەی پێویستە لەسەری وهەڵوێستی خەڵکی بەرامبەر بەئاین ، لەوەدا کە هەندێکی دەبێ بەموسڵمان وتەنها بۆ

خۆیەتی‌وهەندێکی دەبێ بە موسڵمانی بانگخوازو بەهەمان شێوە خەڵکانێك دەبن بەکافرو پشت هەڵدەکەن لە ڕاستی وتەنها کوفرەکەیان بۆ خۆیانەو هەشیانە کافرەو ڕێگری دەکات لە بلاو بوونەوەی هەق وڕاستی..وانەی یەکەمی دەست پێدەکات بە(إقرأ) بخوێنە..چونکە خوێندن هۆکارێکی گەورەی فێر بوونە، خوێندنێك کە بە ناوی ئەو پەروەردگارەوە بێت کە دروستکارو بەدیهێنەرە(بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) (العلق:١) ، ئەو خوایەی کە مرۆڤی دروست کردووە لەچەند خانەیەکی نەناسراو لەناو منداڵدان دا(خلق الانسان من علق) هەروەها ئەو چەند خانەیە وەك (زەروو)ە کەبەدیواری منداڵدان دا هەڵواسراوەو لەڕێی خوێنەوە خۆراك وەردەگرێ...جارێکی تر جەخت دەکاتەوە لەسەر خوێندن(اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ،الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ، عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ) بخوێنە، لەکاتێك دا پەروەردگاری تۆ بەخشندەیەو ئەو زاتەیە کە بەهۆی قەڵەمەوە زانستی وزانیاری فێر کردووە ، ئادامیزادی فێری ئەو شتانە کردووە کە نەیزانیبوون..ئینجا باسی هەڵوێستی‌خەڵکی دەکات بەرامبەر ئەم ئاینەوبەرامبەر نیعمەت وبەخششەکانی خوا( كَلَّا إِنَّ الْإِنْسَانَ لَيَطْغَى,أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى) (العلق:٦-٧)نەخێر، لەگەڵ ئەو هەموو چاکەو ڕێزەدا کە خوا بەخشیویەتی بە ئادەمیزاد ، بەڕاستی خەڵکی سەرکەشی دەکەن ، یاخی دەبن و ستەم دەکەن ، هەرئەوەندەی کەشتێکیان بەخۆیان شك بردو وایان زانی دەوڵەمەندو بێ‌نیازن...ئنجا ئەوەیان دەخاتە بەرچاو کە گەڕانەوەیان بۆلای پەروەردگارە (إِنَّ إِلَى رَبِّكَ الرُّجْعَى) (العلق:٨) بەڵێ.. لەخۆ بایی بوون ولەسنوور دەرچوون و ستەم کردن سیفەتی مرۆڤە ، جا هەندێك کوفر دەکەن و ڕێی هەقیش لەخەڵکی دەگرن،(أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَى، عَبْداً إِذَا صَلَّى) (العلق:٩-١٠) باشە، پێم بڵێ، ئایا ئەو کەسەی کە ڕێگری دەکات لە بەندەیەکی خوا کاتێك نوێژ

دەكات...(أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ عَلَى الْهُدَى ▪ أَوْ أَمَرَ بِالتَّقْوَى )العلق: ١٢ ،ئەی ئەگەر ئەو كەسەی قەدەغەی لێدەكرێت لەسەر ڕێبازی هیدایەت وچاكەبێت ( هەر بۆ خۆی موسڵمان بێت )،یان فەرمانی خواناسیبكات وبانگخواز بێت.. ئنجا دێتەوە سەرباسی ئەوانەی كە بۆ خۆیان كوفر دەكەن (أَرَأَيْتَ إِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى ، أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى) (العلق:١٤)ئەی ئەگەر كابرای خوانەناس بەرنامەی خوا بەدرۆ بزانێ وپشتی تێبكات ، ئایانەیزانیوە كەخوا دەیبینێت وئاگای لێیەتی..ئینجاهەڕەشەیان لێدەكات ( كَلَّا لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ لَنَسْفَعاً بِالنَّاصِيَةِ، نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ) (العلق: ١٦) نەخێر.. سوێند بەخوا ئەگەر كۆڵنەدات وكۆتایی بە دوژمنكاری نەهێنێ، ئێمە پێشە سەری دەگرین وبۆدۆزەخ كێشی دەكەین، ئەو پێشە سەرە درۆزنە تاوانكارە(چونكە پێشە سەرو بەشی پێشەوەی مێشك بەرپرسە لە بیركردنەوەو هەڵبژاردنی ڕێی چاك وخراپ)..دەی ئنجا دەستی بە كێ دا ئەگات لە هاوەڵ ودۆستانیا بابانگیان بكات(فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ) ، ئێمەش فریشتەكانی كاربەدەستی دۆزەخیان بۆ بانگ دەكەین بچنە گیانیان(سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ) (العلق:١٨)، ئنجا ڕێنمایی حەزرەت(ص) وبڕواداران دەكات بەرامبەریان كە بەگوێیان نەكەن وسەرگەرمی خواپەرستی نزیك بوونەوە بن لە خوای پەروەردگار( كَلَّا لا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ) (العلق:١٩) ...

**پێنجەم**/ سوورەتی(القیامە)یش،تەوەرەی باسەكانی مەسەلەی قیامەت و لێپرسینەوەیە ▪ هەرچەند وانەیەكی تایبەتی تیایە بۆحەزرەت(ص) كە لە كاتی دابەزینی قورئان دا بۆسەری بەپەلەپەل نەیلێتەوە لە ترسی لەبیرچونەوە، چونكە خوا خۆی دەیچەسپێنێ لە دڵ ودەروونیدا، جائەمەش وەك ئەوەوایە كە لە كاتی وتنەوەی وانەیەك دا مامۆستایەك هەندێ ئامۆژگاری قوتابیەكانی بكات دوور لەباسی وانەكەیان.. قورئان دەفەرموێت:

* (لاأقسم بيوم القيامة )... سوێند دەخۆم بەڕۆژیقیامەت
* ولاأقسم بالنفس اللوامة.. سوێند دەخۆم بە ویژدانی زیندوو ونەفسی ڕەخنە لەخۆگر کە لۆمەی خۆی دەکات..
* أيحسب الإنسان أن لن نجمع عظامه...ئایامرۆڤ وادەزانێت هەرگیز ئێسکەکانی کۆناکەینەوە؟!
* بلى قادرين على أن نسوى بنانه...بەڵێ ، لەوە زیاتریش دەکەین وتوانامان هەیە کە نەخشە وردەکانی سەرپەنجەکانی دروست بکەینەوە....
* بل يريد الإنسان ليفجر أمامه..نەخێر ، باگومانی وانەبات ، بەڵکو ئادەمیزاد دەیەوێت گوناهو تاوان بکاتە پیشەی خۆی بەدرێژایی ژیانی، یاخود دەیەوێت قیامەت لەبەردەمیدا بەرپا ببێت ئنجا باوەڕی پێ بهێنێت ..
* يسأل ايّان يوم القيامه... بێباکانە دەپرسێت: کوا ، کەی ڕۆژی قیامەت بەرپا دەبێت ؟ (بەخەیاڵیخۆی زۆر بەدووری دەزانێت)
* فإذا برقَ البصر، وخسفَ القمر ، وجُمِعَ الشمسُ والقمر ... کاتێك کەچاو ئەبڵەق ئەبێتو، مانگیش دەگیرێت وتاریك دەبێت وخۆرو مانگ کۆدەکرێنەوەو دەچنە پاڵ یەك...
* ( يَقُولُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ) (القيامه:١٠) ..ئەو ڕۆژە مرۆڤ دەڵێت : ئەی هاوار بۆ کوێ ڕابکەم ولە کوێوە خۆم ڕزگار بکەم..
* ( كَلَّا لا وَزَرَ الى ربّك يومئـذٍ المستقرّ).. نەخێر دەربازبوون نیەو دەبێ لای پەروەردگارت ئامادەبیت و ئۆقرە بگریت بۆ لێپرسینەوە.
* ( يُنَبَّأُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ) (القيامة:١٣) ... لەو ڕۆژەدا مرۆڤ هەواڵی هەموو ئەو کردەوانەی دەدرێتێ کە کردویەتیو ئاسەواری ئەو کردەوانەشی کە دوای خۆی هاتونەتە دی .

* (بَلِ الْإِنْسَانُ عَلَى نَفْسِهِ بَصِيرَةٌ، وَلَوْ أَلْقَى مَعَاذِيرَهُ) (القيامة:١٤-١٥)...
بەڵکومرۆڤ خۆی شایەتە بەسەر خۆیەوە وئەندامەکانی لەش شایەتی لەسەر ئەدەن ، هەرچەند پاکانە بکات وبیانوو بهێنێتەوە..تائێرە باسی قیامەت بوو، ئنجا دێتە سەر ئامۆژگاری و وانە پەروەردەیەکەی حەزرەت(ص) کە پێی دەفەرموێت ( لا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ ،إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ، فإذاقرأناه فأتبع قرآنه، ثمَّ إنَّ علينا بيانه (القيامة:١٦-٢٠) واتە:پەلە مەکەو زمانت مەجوڵێنە، بۆ ئەوەی پەلە بکەیت لە وەرگرتنیدا ، بەڕاستی لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەوخوێندنەوەی ، جا کاتێك ئێمە دەیخوێنینەوە تۆش شوێنمان بکەوە لەخوێندنەوەیدا، پاشان بەڕاستی ڕوون کردنەوەشی لەسەرئێمەیە... ئنجا لەمەسەلەی پەلەکردنەوە کە سیفاتێکی مرۆڤە ، ئایەتەکە دەبەستێتەوە بەباسی پەلەکردنی ئادەمیزادوحەزکردنی لە دنیا کە(عاجلە)یەوشتێکی کەم وکورت وخێرایەوتەواو دەبێت ودەفەرموێت :
* كلاّ بل تحبونَ العاجله... نەخێر ،وانی‌یە ( زیندوبوونەوە هەردەبێت )،دیارە ئێوە هەر ئەم دنیایەتان خۆش دەوێت کە بەپەلە بەسەردەچێت.
* وتــذرون الآخـــرة..قیامەت و بەهەشت پشت گوێ دەخەن و وازی لێدەهێنن..ئنجا دێتەسەر ئەو ڕووانەی کە گەشن وئاسوودەن بەبینینی پەروەردگاریان و، هەروەها ئەو ڕووانەش کە ڕەش وگرژوتاڵن ودۆزەخین ودەفەرموێت: (وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ ، إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ) (القيامة:٢٢-٢٣) ..
ئەو ڕۆژە ڕووخسارانێك گەشاوەو ئاسوودەن وتەماشای پەروەردگاریان دەکەن..

* (وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ، تَظُنُّ أنْ يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ) (القيامة:٢٤-٢٥) هەر لەو ڕۆژەش دا ڕووخسارانێکی تر ڕەش وتاڵن ، چاوەڕوانن کارەساتی پشت شکێنیان بەسەردا بهێنرێت .

* كلا إذا بلغتِ التراقِي ، وقيلَ من راق.. نەخێر ئەوخەڵکە هەروا ژیانیان بەردەوام نابێت بەڵکو کاتێك دێت کە ڕۆحی یەك بەیەکیان دەگاتە گەروویان ، ئەوسا دەوترێت ، کێ فریادڕەسیەتی؟

* وظنَّ أنه الفراق والتفت الساقُ بالساق .. بەڵام لەو کاتەدا ،ئەوکەسەی لەسەرەمەرگدایە دڵنیایە کە ئیتر هیچ شتێك فریای ناکەوێت وکاتی ماڵ ئاواییە..ئیتر قاچی لەیەك دەئاڵێت..

* الى ربِّك يومئذالمساق... ئەوسا لەو ڕۆژەدا بۆ لای پەروەردگارتە ڕاپێچ کردن...

* فلا صدَّقَ ولا صلَّى ولكن كذَّبَ وتولَّى... نە بڕوای هێناونە نوێژی کرد بەڵکو هەربڕوای نەهێناوپشتی تێکرد .

* ثمَّ ذهب الى أهله يتمطى..پاشان هەموو جار بە لەنجەو لارو خۆبادانەوە دەگەڕایەوە ناو کەس وکاری وکەشخەی دەکرد ..

* أولى لك فأولى، ثمَّ أولى لك فأولى..جائەم دۆزەخە بۆ تۆشیاوترو لەبارترە، پاشان هەر ئەوسزایە بۆتۆ شیاوترو لەبارترە ..

* أيحسبُ الإنسان أن يُترك سدى،ألم يك نطفة من منى يُمنى ، ثمَّ كان علقة فخلق فسوى فجعل من الزوجين الذكر والانثى..
ئایا ئادەمیزاد وادەزانێت هەروا وازی لێ دەهێنرێت ولێی ناپرسرێتەوە؟باشە کاتی خۆی نوتفەیەك نەبووە لەمەنی کە دەڕژێنرایە شوێنی خۆی وپاشان خۆهەڵواسەرێك نەبوو گەشەی کردو ئینجا هەر لەو مەنی یە هەردوو جووت نێرومێی دروست کردووە ؟؟...

* أليس ذالك بقادر على أن يُحيَ الموتى...ئايا ئەو زاتەی ئەوە بكات ناتوانێت مردووەكـان زیندووبكاتـەوە؟ ( بـەڵێ..دەتوانـێ وئێمـە لەسـەر ئـەوە شـایەتی دەدەین ئەی خوای پەروەردگارمان ) ..

**بنەمای چوارەم: وردبونەوەلەدەقێكی قورئانی كەچەند ڕووی هەیەو چەندمەبەستی پەروەردە و فێركردنی تیایە..**

دەقی ئەدەبی‌بەرزو بەپێز جاری واهەیە كۆمەڵێ ئامانج دەپێكێ وهەموو ئەو ئامانجانـەش مەبەسـتن، بـە تایبـەتی كـاتێك بـۆ كۆمـەڵێك بووتـرێ كـەپێك هاتبێ‌لەچـەند چینـو توێژێكـی جیـاواز... بـۆ نموونـە:سـوڵتانێك فـەرمانێك دەردەكات هەڕەشە ئامێزە بۆ هەر كەسێ كە بە گوێی نێردراوەكەی نەكات لە كارێكدا كە ڕای سپاردووە.. ئەم فەرمانە دوو ڕووی هەیە:

أ/ هەڕەشەیە بۆ ئەوانەی كە نیازی سەرپێچیان هەیە تا سەرپێچی نەكەن

ب/ هان دانە بۆ نێردراوەكە بۆ ئەوەی چاكتر بەكارەكەی هەستێ‌چونكە دەزانـێ گرنگی دراوە بە كارەكەی وسوڵتان پشتگیرێتی..

جاری واش هەیە دەقێك سێ ئامانجی لەخۆ گرتووە یان بگرە زیاتریش و هەر كەسە وبەپێی خـۆی سـوودی لێوەردەگرێـت ، ئنجـا دەقـە قورئانی‌یـەكانیش ئاوەهان ، جاری وا هەیـە ، هەڕەشـەیە بۆكافران وپەیمانی خێرە بۆموسڵمانان وپەروەردەو دڵنیایی ودڵنەوایشە بۆ حەزرەت(ص)..بۆ نموونە:

یەكەم/قورئان لە سوورەتی(المدثر)دا دەفەرموێت:

( سأصليه سقر ، وماأدراك ماسقر، لأتبقى ولا تذر، لوّاحة للبشر،عليـها تسـعة عشر، وماجعلنا أصحاب النار إلاّ ملائكة....) واتە:(وەلیدی كوڕی موغیرە) كە ئەوشایەتی‌یە ناهەقەی داو دژی ئیسلام وقورئان قسەی كرد، دەبێت بیگەیەنمە ناو دۆزەخ ، جاتۆ نـازانی دۆزەخ چی‌یە.. هیچ ئەندامێك ناهێڵێتـەوەو دەسـت

هەڵناگرێت ، پێستیان هەڵدەقرچێنێت وڕەشی دەکات ، نۆزدە فریشتە سەرپەرشتی دۆزەخ دەکەن، جائیمە وەنەبێت کارگوزارانی دۆزەخمان لە کەسانی تر جگە لە فریشتە بەدی هێنابێت :

١=( وما جعلنا عدّتهم إلافتنة للذين كفروا).. ئەو ژمارەیەشمان تەنها بۆ تاقیکردنەوەی کافران داناوە ..

٢=(ليستقن الذين أوتوا الكتاب)هەروەها بۆ ئەوەی ئەوانەی پەڕاوی ئاسمانیان پێدراوە دڵنیا بن لە ڕاستی ئەم قورئانەچونکە لە تەورات وئینجیلدا ئەو باسە هەیە ..

٣=(وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَاناً)بۆ ئەوەی کە بڕواداران زیاتر باوەڕیان دامەزراوبێت..

٤=(وَلا يَرْتَابَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْمُؤْمِنُونَ)ئەوانەش کەپەڕاوی ئاسمانیان پێدراوەو بڕوادارانیش هەق نی‌یە کە تووشی‌دوودڵی‌بن.

٥=(وَلِيَقُولَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ وَالْكَافِرُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلاً ) بائەوانەی دڵ ودەروونیان نەخۆشە لە دووڕووەکان وبێباوەڕان هەر بۆخۆیان قسە بکەن وبڵێن:نیازی خواچی‌یە بەم ژمارەیە؟

٦=( كَذَلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْبَشَرِ) (المدثر:٣١)

بەو شێوەیە باسکرا خوا هەر کەسێکی بوێت گومڕای دەکات ، هەر کەسێکیشی بوێت ڕێنمایی دەکات و، کەس ژمارەی سەربازانی پەروەردگارت نازانێت جگە لە زاتی خۆی ، ئەو ئایەت وفەرموودانە ، تەنها پەندو ئامۆژگارین بۆ ئادەمی.. کەواتە لێرەوە بە ئاشکرا تێدەگەین کە باسکردنی مەلائیکەتانی دۆزەخ وژمارەیان کە نۆزدەن ئەو هەموو مەبەستەی تیایەو ئەو ئامانجانەی هەیە !

**دووەم**/ ماوەیەك لە سەرەتای پێغەمبەرایەتیەوە، بەپێی ویستی خوا جبرائیل نەهات بۆ لای حەزرەت(ص)، ژنی ئەبو لەهەب بەتایبەتی وهەندێکی تر لەخزمان ولە بێبڕوایان وتیان: لەوە دەچێ(محمد)لەدەست شەیتانەکەی ڕزگاری بووبێت وخواکەی لێی زویر بووبێت...قورئانیش لە سوورەتی (الضحـى)دا فەرمووی:(وَالضُّحَى، وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى، مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى، وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَكَ مِنَ الْأُولَى، وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى) (الضحى:١ – ٥) واتە سوێند بەچێشتەنگاو، سوێندبەشەو کاتێك تاریکی دادێنێت،پەروەردگارت دەست بەرداری تۆ نەبووەو وازی لە تۆ نەهێناوەو خەشمی لێنەگرتویت ، بێگومان دواڕۆژو قیامەتیش چاکترە بۆ تۆ لەدنیا، لە ئایندەدا پەروەردگارت ئەوەندە نازو نیعمەتت پێدەبەخشێت کە زۆر پێی ڕازی وخۆشنوود دەبیت..ئەم سورەتە ، أ /دڵنەوایی‌یە بۆ حەزرەت(ص)...ب/دڵنەوایی‌یە بۆ بڕواداران...

ج/ وەڵام دانەوەی پڕوپاگەندەو دەمکوتکردنی دوژمنانە، لەخۆیانەوە تفەنگ بەتاریکی‌یەوە نەنێن ...

**سێیەم**/ سوورەتی (النصر) کە هاتە خوارەوە ئەبوبەکر ئەوەی لێ تێگەیشت کەحەزرەت(ص)لە دواڕۆژەکانی تەمەنیدایەو ئەجەلی نزیکە، بۆیە زۆر گریا، هەروەها(ئیبن عباس)یش دەڵێ:حەزرەتی عومەر منی لەگەڵ هاوەڵاندا دادەنا لەمەجلیسی خۆیدا،لەکاتێك دا کەمن زۆرلەوان منالتر بووم، هەندێکیان لەوە دەچوو پێیان ناخۆش بووبێ، بۆیە ڕۆژێك حەزرەتی عومەر لەمەجلیسەکەیدا پرسیاری لەهەمووان کرد ، چی لەسوورەتی (النصر) تێدەگەن؟؟ ئەوانیش ئەوەی دیارەو ڕوونەو تێی دەگەیشتن باسیان کرد، پاشان ڕووی‌دەمی کردە من ئاخۆ چی لێتێدەگەم، منیش وتم: ئەو سورەتە نیشانەی نزیك بوونەوەی ئەجەلی حەزرەت بوو(ص) ،عومەریش وتی: منیش هەر ئەوەی لێتێدەگەم..

سوورەتەکەش دەفەرموێ ( إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ ، وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجاً، فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّاباً) (النصر:١-٣)

**واتە/ کاتێك یارمەتی وکۆمەکی خوا دێت وشاری مەککە ڕزگار دەکرێت ودەرگای ئازادی والآدەکرێت،خەڵکیشت بینی پۆل پۆل دێنە ئاینی خواوە،ئەوسائیتر تۆ سوپاس وستایشی پەروەردگارت بکەوداوای لێخۆشبوونی لێبکە، چونك بەڕاستی خوا زۆرچاوپۆشی دەکات وتەوبە وەرگرە ..**

لێرەوە تێدەگەین کەبێجگە لەمانا دیارەکەی سوورەتەکە، لایەنێکی تری گرتۆتە خۆی وئاماژەیەکی تریشی تیابوو کە ئەویش نزیك بوونەوەی ئەجەلی حەزرەت(ص) بوو..

**بنەمای پێنجەم / وردبونەوە لەکات وشوێنی دابەزینی ئایەت وهەروەها حاڵەتی نەفسی وکۆمەلایەتی ئەوکاتەی کەتیا هاتۆتە خوارەوە:**

ئەوەی بیەوێ چاکتر لە قورئان تێبگات دەبێت وردبێتەوە و دیراسەی کات وشوێنی دابەزینی ئایەتەکان بکات و، هەروەها ئەو حاڵەتە نەفسی کۆمەلایەتی‌یەی کەتیایا هاتۆتە خوارێ.. چونکە سوورەتە مەککی‌یەکان سیمای تایبەتی خۆیان وشێوازی تایبەتی‌یان هەیەو لەوکاتەدا موسڵمانان کەم بوون وغەریب بوون وکوفر لەدەوریان دەیان چەوساندنەوەو باری دەروونی‌یان جیاواز بوولەمەدینە کەخاوەن دەوڵەت بوون.. سوورەتەکانی مەککە وەك جزمی(عمّ یتساءلون) کە (سیدقطب)لەبارەیانەوە دەڵێت( ئەم جزمە هەمووی وەك بێدار کردنەوەو، سیخورمەو، بانگکردنی‌یەك لەدوای یەك وایە بە دەنگی بەرز بۆ ئاگادارکردنەوەی مەردومی نووستوی خەو گران ، یا هێنانەوە هۆشی سەرخۆشی بێئاگا، یابێدار کردنەوەی‌چەند یاریکەرێکی وا کە

لەیارییەکەیاندا نوقم بووبن و، هەموو شتێکیان لەبیرچوبێتەوە، وەك بانگیان بکات و ڕایان وەشێنێو نقورچیان لێبگرێ ، سیخورمەیان لێبداو یەك لەسەر یەك پێیان بڵێ:بێداربنەوە ، هۆشیاربنەوە ، بیربکەنەوە ، خوا هەیە ، پێغەمبەر هەیە ، ڕۆژی زیندوو بونەوە هەیە ، لێپرسینەوە هەیە ، دۆزەخ هەیە.. هەروەها جاری دووەم وسێیەم و...دەهەم و ، لەگەڵ ئەم بانگکردنانەشدا دەستێکی بەهێز ببێ، کە ئەم نووستووانە ڕاوەشێنێ وئەم سەرخۆشانە هەڵسێنێو، ئەم یاریکەرانە هەڵیچڕێنێ لەیارییەکەیان ، ئەمانیش ناو بەناو چاوێکی خەواڵووهەڵبڕن وخێرا خەویان لێبکەوێتەوە، ئنجا دەست بکاتەوە بەڕاوەشاندنیان وبانگکردنیان وهاوار لێکردنیان ، ناو بەناو نووستووەکان بێداربنەوە، بۆ ئەوەی لەڕووی لاساریەوە بڵێن:

هەڵناستین ، بێدارنابینەوە ، لەپاشا بەرد بگرنە ئەو بانگخوازەی کە بێداریان دەکاتەوە..ئینجا بنوونەوەو دیسان دەست بکاتەوە بە بانگکردنەوەو ڕاوەشاندنیان و، لەگەڵ هەموو جارێکا کەچاو هەڵئەبڕن ، چەشمەندازێکیان نیشان بدات لەچەشمەندازانی ئادەمیو بوونەوەر..

هەرچەند دەوری ئەم جزمە دەکەمەوە شتێکی ئاوەهام بە بیردادێ، وا بزانم ، هەرکەسێکی تریش وردبێتەوە لێێ وەك من وایە، نەخوازەلا ئەوانەی کە لەم ئایەتانە ورد دەبنەوە(فلينظر الإنسان ممَ خُلق)...(أفلا ينظرون الى الإبل كيف خُلِقت؟ وإلى السماء كيف رُفعت؟ وإلى الجبال كيف نُصبت؟ وإلى الأرض كيف سُطحت؟)وە ئەوانەی کە ئەم ئایەتانە دەخوێننەوە(ألم نجعل الأرض مهادا؟ والجبال أوتادا ، وخلقناكم أزواجا، وجعلنا نومكم سباتا ، وجعلنا الليل لباسا، وجعلنا النهار معاشا، وبنينا فوقكم سبعا شدادا، وجعلنا سراجا وهاجا، وأنزلنا من المعصرات ماء ثجاجا، لِنُخرج به حبا ونباتا،وجنات ألفافا، إن يوم

الفصل كان ميقاتا) یا ئەوانەی کە ئەم ئایەتانە دەخوێننەوە (يأيها الإنسان ماغرّك بربّك الكريم، الذى خلقك فسوّاك فعدلك، فى أىّ صورة ماشاء ركّبك)..
ئەم جزمە هەمووی یاباسی دروستکردنی ئادەمی وگیانلەبەرانەو یاباسی چەشمەندازی جیهانە ، کەچەشمەندازێکی لاپەڕەیەکی کراوەیە لە نامەی بوونەوەرو، یاباسی هێندێ ڕووپەڕەی ترش وتاڵی ڕۆژی دواییە کە تەزوو بەناوشان وموچڕك بەئەنداما دەهێنێ) (سەیری تەفسیری جزمی ٣٠ بکە شێخ محمدی خاڵ)..
لەو زەمانەدا عەرەب گرنگیەکی زۆری ئەدا بەلایەنی ڕەوانبێژی وجوانی دەربڕین وقورئانیش بەشێوازو داڕشتنی تەحەددای کردن، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا دەبینین بۆ هەموو زەمانێك شتانێکی وای تیایە کە مایەی هیدایەتن ڕۆژی قیامەت، ئەوەتالەم سەردەمەدا ئیعجازی زانستی زۆر لەقورئان وسوننەتدا دەرکەوتوون کەمایەی هیدایەتی خەڵکانێکی زۆرن....
ئایەتەکانی مەدینەش درێژترن وباسەکانیشی لەبارەی یاساو دەوڵەتداری وبەسەرهاتی گەلی جوولەکەوگەلانی ترو، دووڕووەکان وغەزاکانی حەزرەت و کۆمەڵێ شتی ترەوەن کەجیاوازی ئاشکرایان هەیە لەشێوازی ئایەتەکانی مەککە...
کەموسڵمانان کۆچیان کردە مەدینە، سەرەتای(البقرە) هاتە خوارەوە کەباسی پێکهاتەی کۆمەڵگای تازە دەکات، کەپێك هاتبوولەموسڵمانان ودووڕووەکان وجوولەکەکان، دیارە بۆ بەرچاو ڕۆشنکردنی موسڵمانان بوو تابزانن چۆن مامەڵەبکەن لەگەڵیانداو لەو بارو زرووفە تازەیەدا کاربکەن ! ..

## بنەمای شەشەم/ تەفسیراتی جوزئی ومانای گشتی

لەکاتێك دا ئایـەتێك مانایـەكی گشـتی وكۆمـەڵێ مانـای جوزئیشـی هـەبێ كـە بتوانرێ تەخصیص بكرێ بەیەكێ لەو مانایانە، ئەوا تخصیص دەكرێ‌و، ئەگەر دەلیلێك نەبێ بۆتەخصیص ئەوا هەموو مانا جوزئیەكان دەگرێتەوە، بۆ نمونە:

**یەكـەم**/ خـوای پـەروەردگار بـەبڕواداران دەفـەرموێت كـە لەهـەموو كـاتێك وباروزروفێكدا لەجیهاد دوانەكەون وتواناكانیـان بخەنەكار بۆ خزمـەتی دینـی خوا (إنفروا خفافا وثقالا وجاهدوا بأموالكم وأنفسكم فی سبيل الله ذلكم خير لكم إن كنتم تعلمون)التوبة٤١

لەلای موفەسیرەكان(خفافاوثقـالا)بەم چـەند مانایـە ڕاڤـە كـراوە كـە هـەموویان دەگرێتـەوەو پێویسـت ناكـات تخصیـص بكرێـت بەیـەكێكیان، ئەمـەش تەفسیرەكانە :

- بچن بۆ غەزا لەكاتی چالاكی‌و سستی‌داو لەكاتی تواناوبێ‌هێزی دا...
- بچن بۆ غەزا لە خۆشی وناخۆشی‌و تەنگانەو فەرەحی‌دا...
- بچن بۆ غەزا لەكاتێك دا ئەگەر دەوڵەمەند بن یا هەژاربن ..
- بچن بۆ غەزا ئەگەر چەكتان كەم پێ‌بێ یان زۆرتان پێ‌بێ..
- بچن بۆ غەزا بەپێ‌بێ یان بەسواری...
- بچن بۆ غەزا ئەگـەر ماڵ ومناڵتـان كـەم بـێ ،یان زۆربـێ و بارتـان گـران بێ...
- بچن بۆ غەزا ئەگەر لاوبن یان پیربن ..

**دووەم**/لەسـەرەتادا موسـڵمانان بـۆ ماوەیـەك ڕوویـان كـردە (بیـت المقـدس)و دوایی‌خوای گـەورە ڕووگـەی بـۆ گۆڕینـەوە بـەرەو(كەعبـە)، كەسـانی ناحـەزو سادەو ساویلكە كەوتنە تانەو تەشەردان ودەیان ووت: ئەوەچی وای لێكردن

ڕووگەی خۆیان بگۆڕن(سيقول السفهاءمن الناس ماولاّهم عن قبلتهم التى كانوا عليها) لەتەفسیری(السفهاء) دا
*( الزجاج) دەڵێ:مەبەست عەرەبە موشریکەکانە ..
*(مجاهد)دەڵێ: مەبەست زانایانی جوولەکەیە..
*(سدّی) دەڵێ: مەبەست دووڕووەکانە ..
*(ئیبن کثیر) دەڵێ: ( السفهاء) ئەو سێ دەستەو تاقمە دەگرێتەوە، کەواتە کەماناکەی بەگشتیئەو سێدەستەیە بگرێتەوە پێویست ناکات تایبەت بکرێ بەتاقە کۆمەڵێکیانەوە، چونکە ڕەنگەجوولەکەکان ئەو قسانەیان کردبێو دووڕووەکان وموشریکەکانیش قۆستبێتیانەوەو وتبێتیانەوە، چونکە دووڕووەکان و موشریکەکان بەچاوێکی بەرز سەیری ئەهلی کیتابیان دەکردو دەیانزانی کەپەڕاوی ئاسمانیان هەیە، جابۆیە تەنسیقیان لە گەڵدا دەکردن بۆ دژایەتی وبەربەرەکانیّی پێغەمبەر(ص)و موسڵمانان...
**سێیەم/** خوای پەروەردگار لەسوورەتی(القمر) دا دەفەرموێ ( إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِنْدَ مَلِيكٍ مُقْتَدِرٍ) (القمر:٥٤ ) وشەی(نَهَر) بەکار هاتووە لەبەر ئەوەی لەگەڵ کۆتایی ئایەتەکانی تری سوورەتەکەدا بگونجێ کە کۆتایی هاتوون بە ( القَمَر، مُستمر ،مُستقرّ ، مُزدَجَر، محتَظر، يسَحَر، شَكَر، سقَر،بقدَر، ....هتد) ئنجا چەند مانایەکیشی هەیە کە هەموو ماناکان مەبەستن وەسفی بەهەشتن،( نَهَر)واتە :

١. الأنهار: ڕووبارەکان
٢. سعة الرزق:رزق وڕۆزی زۆر
٣. الضياء: ڕووناکی ...

**چوارەم/** لەسوورەتی (فاتیحەدا) (مـالكِ یـوم الدیـن)هـاتووە كە( یـوم الدیـن) چەند مانایەكی هەیە ، ئەویش ( یوم الجزاء ، یوم الحساب ، یوم الطاعة ، یوم القهر )ە كە ئەو هەموومانایەش بەمەبەست بەكارهاتووەو هەموویان دەگرێتەوە، چونكە ڕۆژی قیامەت ڕۆژی جەزاوحیساب وگوێڕایەڵی بۆ خواو ڕۆژی زەبوونی وبێدەسەلاتی‌یە.... ئەوەشمان لە بیر نەچێ كە هەڵبژاردنی وشەی (الدین) لەوێدا گرنگە كە دەگونجێ لەگەڵ كۆتایی ئایەتەكانی پێش ودوای‌دا كە( رَّب العالمین ، وإیّاك نستعین ، الضالّین)ە....

**بنەمای حەوتەم/ تەفسیری قورئان بە قورئان** :

لە بەر ئەوەی قورئان هیچ جۆرە دژایەتی‌وناتەواوی‌یەكی تیانیە ، ئایەتی هەیە ئایەتی تر تەفسیر دەكات . بۆنموونە :

كاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ( الذین امنوا ولم یلبثوا ایمانهم بظلم اولئك لهم الامن وهم مهتدون ) الانعام ٨٢/ هاوەڵان زۆر ترسان و وتیان جا باشە كێ هەیە زوڵمی لە نەفسی خۆی نەكردبێت ،مانای وایە كەسمان رزگارمان نابێت ، بۆیە هاتنە خزمەت حەزرەت وپرسیاری ئەم ئایەتەیان لێكرد ، ئەویش بەئایەتی (١٣)ی سورەتی لوقمان بۆی تەفسیر كردن كە دەفەرموێت :( ان الشرك لظلم عظیم ) واتە : ئەو ستەم و زوڵمە مەبەست هاوەڵ پەیداكردنە بۆخوا ..

بەمەش ئایەتەكە ماناكەی دەبێت بەوەی : ئەوانەی بڕوایان هێناوەو خۆیان پاراستووە لە هاوەڵ پەیداكردن بۆ خوا ، ئەوانە ئارامی و ئاسایشی مادی‌و مەعنەویان بۆ هەیە لە دنیاو لەقیامەتدا و ئەوانە ڕێنمایی كراوو سەرفرازن...

**بنەمای هەشتەم / گەڕان بەدوای تەفسیری** (مأثور)**دا** :

ئەوەی بیەوێت لەئایەتێك وردبێتەوە، دەبێت بگەڕێت بەدوای تەفسیری حەزرەت(ص) بۆ ئەو ئایەتەوئەگەر ڕاست بوو فەرموودەكە بەدڵنیایی‌یەوە وەریدەگرین، جائەگەر حەزرەت(ص)تەفسیری نەكردبوو دەكرێت بگەڕێین

بەدوای تەفسیری هاوەڵان وپێشینانی خواناس دا، ئەگەر ڕاستییان پێکابوو، وەبەڕاستی ڕیوایەت کرابوو ئەوە دەکرێت سوودی لێوەربگرین وئنجا بشگەڕێین بەدوای لایەنەکانی تری تەفسیرەکەدا ئەگەر هەبێت.. چونکە دەرگای هەوڵ وگەڕان وووردبوونەوە دانەخراوە... بۆ نموونە: خوای گەورەدەفەرمووێت :
(وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعاً مِنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ) (الحجر:٨٧) واتە/سوێند بێت ئێمە حەوت ئایەتمان پێداویت، هەروەها قورئانی گەورەو مەزنیشمان پێبەخشیویت... بوخاری گێڕاویەتیەوە کە حەزرەت(ص) فەرموویەتی(أمّ القرآن هی السبعُ المثانی والقرآن العظیم) واتە/(أم القرآن)کەفاتیحەیە (سبع المثانی)یە واتە حەوت ئایەتەو بەردەوام دووبارە دەکرێتەوە هەروەها ( القرآن العظیم )یشە ، واتە مەزنترین وگرنگترین سوورەتە لەقورئاندا...
هەروەها لە ئایەتی ( ومثل کلمة طیبة کشجرة طیبة )ابراهیم /٢٤ ی تەفسیر کرد بەوەی شجرة الطیبة مەبەست دارخورمایە ..ل٢٢٦ کیف نتعامل مع القران /القرضاوی ..

**بنەمای نۆیەم/وردبوونەوە لەقۆناغەکانی هاتنە خوارەوە :**

بۆ تێگەیشتن و وردبوونەوەی زیاتر لەقورئان دەبێت ئاگامان لە قۆناغەکانی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان بێت ، کام ئایەت لەمەسەلەیەکدا پێشتر هاتووەو کامیان دواتر هاتووە ، چونکە هەندێ لە حوکمەکانی قورئان بەچەند قۆناغێك هاتوونەتە خوارەوەو ڕەچاوی باری دەروونی کردوون وبەچەند هەنگاوێك پەروەردەی کردوون ، وەك قۆناغەکانی جیهادویاساغ کردنی مەی وسووخۆری و...هتد ، زانایان هەر لە کۆنەوە لێکۆڵینەوەیان کردووە لەسەر ئەوەی کەچەند سوورەت لەمەککە هاتوونەتە خوارەوەو چەندیش لە مەدینە، هەروەها چەند ئایەتی مەککی هەیە لە سوورەتە مەدەنییەکاندا دانراون

وچەندی مەدەنی لەسوورەتە مەککی یەکاندا دانراون... هەرچەندە ڕەنگە کەمێك ڕای جیاواز هەبێت بۆ هەندیٚئایەت بەڵام ئەوە زۆر لەمەسەلەکە ناگۆڕێت...
عبدالله ی کوڕی مسعود وئیبن عەباس کەحەزرەت(ص) دوعای بۆ کرد خوای گەورە شارەزای بکات لەقورئاندا، دەڵێن:هیچ ئایەتێك نی‌یە نەزانین لەکویٚ هاتۆتە خوارەوەو کەی هاتۆتە خوارەوەو ماناکەی چی‌یە.....
(سەیدقوتب)یش بەڕەحمەت بێت زۆر ڕەچاوی ئەم مەسەلەی قۆناغانەی کردوەو خوای گەورە تەوفیقی داو(منهجی حرکی وتربوی) لە قورئاندا شی کردەوەو لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەلی لەسەر کردو تەفسیرێکی ناوازەی زۆر چاکی نووسی کە لەبواری پەروەردەو منهجی‌حرکی‌دا تائێستا تەفسیری وانەنووسراوە...

**نموونەی یەکەم/ قۆناغەکانی‌یاساغ کردنی مەی :**

ئاشکرایە کە مەی بەشێك بووە لەژیانی عەرەب و ئالوودەی بووبوون وچەندەها ناویان لیٚنابوو، لەهۆنراوەکانیشیاندا زۆریان بەبالآیدا هەڵداوە.. بۆیە قورئان لەسەر خۆو پاش چەسپاندنی ئیمان وبڕوا لە دلٚ ودەروونیاندا ، بەچەند قۆناغێك داوای لیٚکردن کە دەستی لیٚهەلگرن وئەوانیش بەیەکجاری دەست بەرداری بوون . ئەو ئایەتانەش کە لەو بارەیەوە هاتن:

أ- لەمەککە ئەم ئایەتە هاتە خوارئ کەوەسفی حەزرەت(ص)دەکات کەهەرچی پاك وباش بێت حەلآلی دەکات وئەوەش کە پیس وخراپە یاساغی دەکات (الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوباً عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ ) (الأعراف١٥٧) واتە:(ئەوانەی کە شوێنی ئەم(محمد)ە پێغەمبەرە هەواڵدەرە نەخوێندەوارە دەکەون ئەوەی کە گاوروجولەکە، ناونیشانی نووسراوە لایان، فەرمانیان پیٚدەدات بەچاکەو قەدەغەی گوناهو

خراپەیان لێدەکات وهەرچییەك پاك وچاکە بۆیان حەلاڵ دەکات وهەرچی پیس وناپوختە لێیان حەرام دەکات.. ئنجا هەر لەمەککە ئاماژەیەکی تر هات( وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَراً وَرِزْقاً حَسَناً) (النحل:٦٧) واتە/ لە بەرووبومەکانی دارخورماورەزو ترێکانیش هەندێجار شتی سەرخۆشکەر دروست دەکەن ، گەلێ جاریش ڕزقی باش وبەرهەمی چاك وبەسوود ، وەکو (دۆشاوو مێوژو شەربەتو... هتد)،( (إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ)بەڕاستی ئالەوەشدا بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا هەیە بۆ کەسانێك عەقڵ وژیری خۆیان دەخەنە کار... لێرەدا ڕزق وڕۆزی پاکی جیا کردەوەو تیێ گەیاندن کە شتی سەرخۆشکەر ئەو وەسفە چاکە وەرناگرێ وشتێکی باش نیە !

ب- لەمەدینەش لەسەرەتاوە پرسیار دەکرا لەبارەی مەی وقومارەوە ، قورئانیش وەڵامی دانەوە ( يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا ) (البقرة:٢١٩)
واتە/پرسیارت لێدەکەن دەربارەی عەرەق وقومار، پێیان بڵێ: لەو دووانەدا تاوانێك وگوناهێکی گەورە هەیە ، هەرچەندە چەند سوودێکیشیان تێدایە بۆ خەڵکانێك، بێگومان گوناهەکەیان گەورەترە لەکەڵك وسوودیان...

ج-ئنجا بەدوایدا ئەم فەرمانە خواییە هاتە خوارەوە( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَقْرَبُوا الصَّلاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ ) (النساء:٤٣) واتە:ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە نزیکی نوێژ مەکەون لەکاتێکدا سەرخۆشن، هەتاوەکو بزانن چی دەڵێن لەنوێژەکەدا... بەمەش کاتی مەی خواردنەوەیان لێ تەنگ بووەوە،چونکە ڕۆژی پێنج نوێژ هەیەو ماوەی نێوانیان کەمەو فریای مەی خواردنەوەو هاتنەوە هۆش خۆیان نەدەکەوتن...

د- ئینجا دوا فەرمانی قەدەغە کردن هات وفەرمووی :

( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ, إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ, وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَاحْذَرُوا فَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا عَلَى رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ) (المائدة: ٩١-٩٢) واتە/ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دڵنیابن ،عەرەق وقومارو گۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خوا لەو شوێنانەی کەخەڵك بەپیرۆزی داناوە نەك ئیسلام، بورج وحەڵاڵ وحەرام زانین بەهۆی هەڵدانی زارەوە، ئەمانە هەرپیسن ولەکارو کردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێوەش خۆتانی لێدوور بگرن وخۆتانی لێبپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازیی وبەختەوەری بەدەست بهێنن،بەڕاستی شەیتان دەیەوێت لەڕێگەی عەرەق وقومارەوە دوژمنایەتی وبوغزو کینە بخاتە نێوانتانەوەو لەیاد کردنی خواو ناوە پیرۆزەکانی وێڵتان بکات، هەروەها سست وتەمەڵتان بکات لە ئەنجام دانی نوێژەکان بەشێنەیی، ئایا ئیتر بەس نییە؟ ئایا کۆڵ نادەن ودەست هەڵناگرن... ئەی ئیمانداران فەرمانبەرداری خوابن ، فەرمانبەرداری پێغەمبەریش بن و، وریابن وئاگاداربن، جا ئەگەر پشت هەڵکەن ویاخی ببن ئەوە بزانن بەڕاستی کاری پێغەمبەری ئێمە تەنها ڕاگەیاندنی ئاشکراو ڕوونی پەیامەکەیە( جا کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ، جاڕدرا بەناو شاری مەدینەدا کە مەی حەرام کراوە، ئیتر بڕواداران هەرچی گۆزەو کوپەی عەرەق هەبوو قلپیان کردەوەو بەتەواوی وازیان لەمەی خواردنەوە هێنا ) ..

**نموونەی دووەم / هەنگاوەکانی یاساغ کردنی سووخۆری:**

سوو خواردن بەیەکجار قەدەغەنەکرا ، بەڵکو ئەگەر سەیری ئەو ئایەتانە بکەین کە لەسەر ئەو مەسەلەیە هاتوون دەبینین بەچەند جارێك ڕێنمایی ئنجا حەرام کراوە ، ئایەتەکانیش:

ا- لە کۆتایی بانگەوازی مەککەدا خوای گەورە ئاماژەی بەوەکرد کە مامەڵە کردن بەسوو خوا بەرەکەتی تێناخات وفەرمووی ( وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ رِباً لِيَرْبُوَ فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلا يَرْبُو عِنْدَ اللَّهِ وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ) (الروم:٣٩) واتە/ هەر پارەو سامانێکتان بە سوو دابێت بەخەڵکی بۆ ئەوەی زیاد بکات لەناو سامانەکەیاندا، ئەوە بەرەکەتی تێناکەوێ وپاداشتی نابێت لای خوا ، بەڵکو لێپرسینەوەشی لە دوایە . ئەوەش بەزەکات داوتانەو مەبەستتان ڕەزامەندی خوایە . ئائەو جۆرە کەسانە پاداشتیان چەند بەرابەر کردۆتەوە .

ب- لەسەرەتای مەدینەشدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَأْكُلُوا الرِّبَا أَضْعَافاً مُضَاعَفَةً وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ، وَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ) (آل عمران:١٣١)
واتە/ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە سوو بەچەند قات وبەرامبەر مەخۆن، لەخوابترسن ، بۆ ئەوەی سەرفراز بن...

( تێبینی: ئەم باسەی سوو خواردن لە سوورەتی ال عمران دا تێکهەڵکێش کراوە بە باسی غەزای ئوحود، ئەمەش دیارە حیکمەتی تیایەو ڕەنگە بۆ ئەوە بێت کە بیسەلمێنێ ئەم ئاینە هەموو چەمکەکانی ژیان دەگرێتەوەو گرنگی دەدات بە هەموو لایەنەکانی ژیان وهەرچی پێویست بێت بۆ بەختەوەری دنیاو قیامەت فەرامۆشی نەکردووە) ..

ج- ئنجا خوای گەورە زەمی جوولەکەی کرد کە سوو دەخۆن . هەرچەندە لێشیان قەدەغەکراوەو ئنجا بەگشتی زەمی سوو خۆری کرد، دیارە ئەمەش پێش دەستی‌یەك بوو بۆ حەرامکردنی ( فَبِظُلْمٍ مِنَ الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ كَثِيراً، وَأَخْذِهِمُ الرِّبَا وَقَدْ نُهُوا عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ مِنْهُمْ عَذَاباً أَلِيماً) (النساء:١٦١)

واتە/ بەهۆی زوڵم وستەمێك لەلایەن ئەوانەی کە بوونەتە جولەکەو بەهۆی ئەوەی کە زۆر کۆسپیان دەخستە بەردەم ڕێبازی خوا ، ئێمە هەندێك نازو نیعمەتمان لێ حەرام کردن ، کە پێشتر بۆیان حەلاڵ بوو.. هەروەها بەهۆی سوو خۆرییانەوە کەبەڕاستی لێیان حەرام کرابوو، بەهۆی ئەوەشەوە کە ماڵی خەڵکی بەناڕەوا دەخۆن هەندێك شتی تریحەلاڵمان لێ حەرامکردن، بێگومان ئەوانەیان کە بێباوەڕن سزایەکی بەئێش وئازارمان بۆ ئامادە کردوون ..

د- ئینجا دوا دەقی قورئان هات بۆ حەرام کردنی یەکجاری سوو خۆری و فەرمووی ( الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبا لا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبا وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبا فَمَنْ جَاءَهُ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّهِ فَانْتَهَى فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ) (البقرة:٢٧٥) واتە/ ئەوانەی سوو دەخۆن ، هەڵسو کەوت ناکەن وڕاست نابنەوە(لەگۆڕدا)مەگەر وەك ئەو کەسەی کە شەیتان دەستی لێوەشاندبێ( هەر لەدنیادا سروشتی نین و ولەقیامەتیشدا وەك شێتن) چونکە ئەوانە دەڵێن: فرۆشتن وەك سوو وایە، لەحاڵێکدا خوا فرۆشتنی حەلاڵ کردووەو سووی حەرام کردووە، جائەوەی ئامۆژگاری پەروەردگاری پێگەیشت و وازی هێنا ، ئەوەی دەستی کەوتووە بۆ خۆی ، کاری لێپرسینەوەشی دەکەوێتە لای خوا، بەڵام ئەوەی دەست بکاتەوە بەسووخۆری، ئا ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن وژیانی هەمیشەیی تیا دەبەنە سەر... ئنجا دەفەرموویت ( يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ وَاللَّهُ لا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ, إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَأَقَامُوا الصَّلاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ ) (البقرة:٢٧٧)واتە/ خوا سوو تەفرو تونا دەکات وبەرەکەتی ناهێڵێ ، بەڵام پاداشتی خێری سامان بەخشین بەرەو پێدەدات وبەرەکەتی تێدەخات، بێگومان خوا هیچ کافرێکی تاوانباری خۆش

ناوێت، بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوەو نوێژەکانیان بەچاکی بەجێهێناوەو زەکاتیان داوە تەنها پاداشتیان لای پەروەردگاریانە، ئەوسا نەترس وبیمیان لەسەرە ، نەغەم وپەژارە دەیانگرێتەوە . ئنجا ڕێنمایی بڕواداران دەکات (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِنْ تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لا تَظْلِمُونَ وَلا تُظْلَمُونَ) (البقرة:٢٧٩) واتە/ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پارێزگارو خواناس بن و واز لەپاشماوەی سوو بهێنن ئەگەر ئیماندارن ، خۆ ئەگەر وانەکەن ، ئەوە جەنگ لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا ڕابگەیەنن( کە سەرەنجامەکەی زۆر سامناکە)، خۆ ئەگەر تەوبەبکەن و لەسووخۆری وازبهێنن ئەوە تەنها سەرمایەکانتان بۆ هەیە وەری بگرنەوە، نەستەم دەکەن لە قەرزارەکان ، نەستەمتان لێدەکرێت..

(وَإِنْ كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ وَأَنْ تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ) (البقرة:٢٨٠) خۆ ئەگەر قەرزارەکە نەداربوو، ئەوا مۆڵەتی بدرێ تادەرووی لێدەکرێتەوەو دەیبێت ، خێرکردنتان بەقەرزارەکەو ئازاد کردنیوبەخشینی، چاکترە بۆتان ئەگەر ئێوە بزانن (چەندە پاداشتی خوایی بێسنوورە).

(وَاتَّقُوا يَوْماً تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لا يُظْلَمُونَ) (البقرة:٢٨١)

واتە/ لەسزاو تۆڵەی ڕۆژێك بترسن کە تیایدا بۆلای خوا دەگەڕێنەوە، لەوەو دوا هەمووکەس پاداشتی کاروکردەوەی خۆی وەردەگرێت وستەمیان لێناکرێت.

ئنجا هەموو ئایەتی(٢٨٢)ی (البقرە ) تەرخان دەکات بۆقەرزدان ودەستگیرۆیی لێقەوماوو هاوکاری کردنی خەڵکی کە درێژترین ئایەتی قورئانە، تاجێگای سووخۆری بگرێتەوە..

**بنەمای دەیەم/ وردبوونەوە لە ئایەتی مەککی لەسورەتی مەدەنی داو بەپێچەوانەشەوە!**

سی وسیٚ سوورەت کە لە مەککە هاتونەتە خوارەوە ، هەندیٚ ئایەتیان تیایە کە لەمەدینە هاتونەتە خوارەوە و، سیٚ سوورەتی مەدینەش ئایەتی مەککی یان تیایە ، سوورەتی -محمد- یش کە مەدەنی یە ئایەتی ژمارە -١٣- ی لە ریٚگای هیجرەتدا هاتۆتە خوارەوە و، سوورەتی -مائیدە- ش کە لەکۆتایی مەدینە دا هاتۆتە خواری ، سیٚ ئایەتی لە دوای سوورەتی -تەوبە- هاتەخواریٚ لە ڕۆژی عەرەفە لە حەجی مالٚ ئاوایی دا٠٠

ئنجا کە لەم دیاردەیە ورد دەبینەوە ، بۆمان دەردەکەویٚ کە گەلیٚ مەبەستی پەروەردەیی تیایە ، چونکە هەندیٚ لەو ئایەتە مەدەنیانە ڕەنگە باسی -احکام- بن و پەیوەندیەکیشی هەیە بە باسی سوورەتە مەککیەکەوە بۆیە لەمەدینە هاتۆتە خواریٚ وخراوەتە سوورەتێکی مەککیەوە بەفەرمانی خوای گەورە٠٠

هەندیٚ لەوئایەتانە پەیوەندیان بە ڕووداوێکی تایبەتەوە هەبووە ، ڕەنگە لە مەدینە ڕووی دابیٚ ، بۆیە ئەو کاتە دابەزێنراوەو ئنجا لە سوورەتە مەککیەکەدا جیٚ ی خۆی گرتووە٠٠

شایانی باسە قورئان هەمووی لە شەوی قەدردا نازلٚ بۆتە ئاسمانی دنیا، دوایی لە -٢٣- ساڵدا بەپیٚ ی پێویست لیٚی دابەزێنرایە خواریٚ وموسڵمانانی پەروەردەکرد ، کافران دەیان ووت: بۆچی هەمووی بە یەکجار نایەتە خوارەوە (وقال الذين كفروا لولا نُزل عليه القران جملة واحدة كذلك لنثبت به فؤادك ورتلناه ترتيلا ، ولا يأتونك بمثل الا جئناك بالحق واحسن تفسيرا ) ٣٣فرقان/واتە : کافرەکان وتیان : هەمووی بۆ بەیەکەوە دانابەزێت ، بێگومان ئێمە هەر بەو شێوەیە ڕەوانەی دەکەین ، تادڵی تۆ زیاتر دڵنیابکەین ، بەردەوام بەجوانی دایدەڕێژین ودەیگەیەنین .. خوانەناسان هیچ ڕەخنەیەکت لیٚناگرن ،

لە بەرامبەر بەوە ئێمە حەقیقەت وڕاستیمان بۆ تۆ نەهێنابێت و بەجوانیھەموو شتێکت بۆڕوون نەکەینەوە ، هەروەهادەفەرموێت ( وقرآنا فرقناه لتقرأه على الناس على مكث ونزلناه تنزيلا ) اسراء١٠٦/ واتە: ئێمەقورئانمان بەش بەش کردووە تا بەشێنەیی وبەئارامی بیخوێنیتەوە بەسەر خەڵکیدا ، هەر ئێمەش بەوشێوەیە دامانبەزاندووە کە تۆ ڕایدەگەیەنیت٠٠

**نموونەی یەکەم/سوورەتی–ق–لە مەککە هاتۆتەخوارەوە ، تەنها ئەم ئایەتەی** نەبێ کە لە مەدینە هاتە خوارێ ، کە دەفەرموێت :(ولقد خلقنا السماوات والارض وما بينهما في ستة ايام وما مسنا من لغوب ) ق٣٨/جوولەکەکان لەمەدینە دەیان ووت کە خوا بە شەش ڕۆژ ئاسمانەکان و زەوی درووست کردووە ، لە یەکشەممەوە بۆجومعەو ، ڕۆژی شەممە پشووی داوە٠ئەمەش لە تەوراتە دەستکاری کراوەکەیاندا هاتووە لە –الاصحاح الثانى/ سفر التكوين–دا.

جا قورئان ئەوەی ڕاست بێ، تەسدیقی دەکات وئەوەش کە هەڵەبێ ڕاستی دەکاتەوە ، بۆیە ئایەتەکە پێیان دەفەرموێ : بەڕاستیئێمە ئاسمانەکان وزەوی وهەرچی لە نێوانیان داهەیە بە شەش ڕۆژ درووستمان کردوون و، هیچ ماندوویەتیەکیش ڕووی تێنەکردین . (کەواتە ئەم ئایەتە لە مدینە پێویست بوو بۆ وەڵامی جوولەکەکان ) ..

ئنجا ئەم ئایەتەش کە لە مەدینە دابەزیوەو لەم سوورەتەدایە کە لەمەککە هاتۆتە خوارەوە ، پەیوەندی بە ئایەتەکانی ترەوە هەیە، بەتایبەت ئەم ئایەتەی دوای خۆی کە بە حەزرەت(ص) دەفەرمووێ: دوژمنان ئاوا بوختان دەکەن ولەخۆیانەوە بەهەڵە لەبارەی خواوە دەدوێن ، کەواتە تۆ ئارام بگرە لەسەر قسەکانیان و لە سەر پڕوپاگەندەکانیان ( فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ، وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَارَ السُّجُودِ) (ق:٤٠) ..

**نموونەی دووەم/** سوورەتی فورقان سێ ئایەتی نەبێت ، هەمووی لە مەککە هاتونەتە خوارەوە ، سێ ئایەتەکەش ئەمانەن ( وَالَّذِينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً، يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَاناً، إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحاً فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً) (الفرقان:٧٠) واتە/ ئەوانەیهیچ شتێك ناپەرستن لەگەڵ خواداو کەسیش ناکوژن کە خوا کوشتنی حەرام کردبێت مەگەر بەحەق ورەوا، هەروەها زینا ناکەن ونزیکی ناکەون، جائەوەی ئەو جۆرە کارە خراپانە ئەنجام بدات، ئەوە توشی سزاوئازارو ریسوایی دەبێت . لە قیامەتیشدا ئازارو سزای بۆ چەند بەرانبەر دەکرێت و، بەزەلیلی وخەجاڵەتی وشەرمەزاری یەوە دەبێت ژیانی تێدا بەرێتە سەر، مەگەر ئەو کەسەی تەوبە بکات وباوەڕ بهێنێت و کارو کردەوەی چاکە ئەنجام بدات ، ئائەو جۆرە کەسانە خوا کارو کردەوە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێت بەچاکە، چونکە هەمیشەو بەردەوام خوا لێخۆشبوومیهرەبانە ( بەرامبەر خەڵکی بەگشتی وئەو جۆرە کەسانە بەتایبەتی) ئەم چەند ئایەتە چونکە تەشریعاتی تیایەو باسی کوشتن وزینا دەکات ، خوای گەورە لە سیفاتی بڕواداراندا لەمەدینە ناردی‌یە خوارێ، جا لەبەر ئەوەی سوورەتی فورقان باسیسیفاتی( عبادالرحمان) دەکات ، بەتایبەتی ڕەوشتە بەرزەکانیان ، جائەم چەند سیفاتەشیان ، تەواوکەری ئەو سیفەتانەن وخوای گەورە لەمەککە ئەو بەشانەی ناردە خوارەوە بۆ پەروەردەی موسڵمانان وئەم سێئایەتەشی لەمەدینە کە سەردەمی دەوڵەتداری ویاسا بوو ناردی‌یە خوارێ تاببێتە بەرنامەی ژیانی بڕواداران .

**بنەمای یانزەیەم/ وردبوونەوە لەئایەتێك بۆئەوەی پارچەپارچە بكرێ یان پێش ودوا بخرێت....**

لەتێگەیشتن و ووردبوونەوەدا لەئایەتێك ، نابێت هەندێوشەی بەناوی(تقدیم وتأخیر)ەوە، جیٚ بگۆڕدرێ، گوایە وامانایەی چاکتر ڕوون دەبێتەوە، یان تەنها بەشێك لەئایەتەكە بهێنرێومانایەكی تریلێدەستكەوێت ، كەمەبەستەكە لەبنەڕەتدا ئەوە نییە....بۆنموونە :

**یەكەم/** خوای پەروەردگار دەفەرموێت (فَلا تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَلا أَوْلادُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ بِهَا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنْفُسُهُمْ وَهُمْ كَافِرُونَ) (التوبة:٥٥) واتە/ ئەی پێغەمبەر(ص) ، ئەی بڕوادار ، نەماڵ و سامان ونە وەچەو نەوەی كافران سەرسامت نەكات وبەخێریان بزانیت ، چونكە بەڕاستی خوا هەردەیەوێت لەژیانی دونیادا تووشی بەڵاو سزایان بكات بەو ماڵ وسامان ومناڵانەیان وبە كافریش گیانیان بكێشێت، كەدیارە ئاخیرەتیشیان هەر چارە ڕەشی وئاخر شەڕییە...

هەندێ لەموفەسیرەكان وەك جرجانی وئیبن عباس و قتادەو تەبەری وشەوكانی و ڕازی ، لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا بەجۆرێك لێكیان داوەتەوە گوایە دەكرێ( فی الحیاە الدنیا) پێشبخرێت ، واتە تەقدیرەكەی ئاوای لێدێت ( فَلا تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَلا أَوْلادُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ بِهَا(فیألاخرة) وَتَزْهَقَ أَنْفُسُهُمْ وَهُمْ كَافِرُونَ) واتە/ سەرسام مەبە نە بەماڵ وسامان ونە بەمناڵی كافران لە ژیانی دونیادا چونكە خوای گەورە دەیەوێ بەو ماڵ وسامان و مناڵانە لەقیامەتدا سزایان بدات وبەكافری گیانیان بكێشێت .... ئەمەش لەبەر ئەوەی گوایە كافران لەززەت وخۆشی دەبینن لەماڵ وسامان ونەوەیان لە دنیادا..

(ئیبن قەیم) بەڕەحمەت بێت وەڵامیان دەداتەوەو دەڵێت: ئازار چەشتن وناڕەحەتی كافران دیارە ، بەهۆی حرص وشپرزەییان بە دوای دنیاداو، هەڵپە

وڕاکە ڕاکیان نایەڵێ پشوو بدەن لە دنیاداو ، هەتا بیانبێت زیاتر کێشەیان هەیە( ئیتر چ پێویست دەکات پێش خستن ودواخستنی تیا بکرێت )...

**دووەم/** خوای پەروەردگار دەفەرموێت ( أفلا ینظرون الـی الإبل کیف خلقت والی السماء کیف رفعت والی الجبال کیف نصبت والی الأرض کیف سطحت فذکر انما أنت مذکر) الغاشیة ٢١واتە : ئایا سەرنجی ووشتر نادەن چۆن دروستکراوە(خۆ گری لەسەر برسێتی وتینوێتی وپێکهاتنی لەشیو..هتد) ، ئایا سەرنجی ئاسمان نادەن چۆن بەرز کراوەتەوە ( ئەو هەموو ئەستێرەو هەسارانە کە بەئاسمانەوەن وعەقڵی مرۆڤ دەستەوسان وکولە لە ئاستیاندا) ئەی سەرنجی کێوەکان نادەن ، چۆن داکوتراون ورەگیان چووە بەناخی زەویدا، ئەی سەرنجی دەشتەکانی زەوی نادەن چۆن تەخت کراوە ، کەواتە تۆ ئەی پێغەمبەر ئەم شتانە بخەرەوە یادیان و ئامۆژگاریان بکە، بەڕاستی تۆ هەر یاد خەرەوەیت...

ئەم ڕێك خستن وسەرنج ڕاکێشانە تابلۆیەکیجوان دەنەخشێنێ، لەپێشدا وشترو قافڵە کە مایەی ژیانیان بووەو بەقیمەت وگرانبەها بووە لای خەڵکی ئەو زەمانە، پاشان لەوەوە بەرەو ئاسمان وئنجا شاخەکان وئنجا زەوی ، بەمەش ئەدا لە دڵی سەیرکەران تا ڕابچڵەکن و هۆشیار ببنەوەو، یەك بەدوای یەك هاتنیبابەتەکان مەبەستە لەئایەتەکەدا...

**سێیەم/**خوای پەروەردگار دەفەرموێت ( وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِی عَدُوّاً شَيَاطِينَ الْإِنْسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُوراً وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ، وَلِتَصْغَى إِلَيْهِ أَفْئِدَةُ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا مَا هُمْ مُقْتَرِفُونَ) (الأنعام:١١٣) واتە/هەر بەو شێوەیە کێشمە کێشی ئیمانداران وخوا نەناسان بەردەوامە، جا بۆ هەر پێغەمبەرێك وئیماندارێك دوژمنێکمان لە شەیتانەکانی ئادەمیزادو پەری سازاندووە، کە

بـەردەوام قسـەی زل وڕازاوە دەدەن بـەگوێی یـەکداوخۆیان وخـەڵکی پێسـەرگەردان وگومـڕا دەکـەن ، جـا ئەگـەر پـەروەردگارت بیویسـتایە نەیاندەتوانی شتی وابکـەن ، دە وازیـان لێبێنـە لەگـەڵ ئـەو درۆو دەلەسەیەی هەڵی دەبەستن( لەدەست خوا ڕزگاریان نابێت)..

شەیتانانی ئینس وجین بەقسەی زل وڕازاوە کافران لەخشتە دەبەن بەم جۆرە

ا- لتصغى اليه أفئدة الذين لايؤمنون بالآخرة / واتە بەدڵ گوێی بۆ دەگرن ئەوانەی بڕوایان بەئاخیرەت نی یە،ئنجا

ب_ وليَرضوه... پێی ڕازی دەبن وقەناعەت دەکەن، ئنجا ئەبێ بەکردار،

ج_ وليقترفوا ماهم مقترفون .... ئەو تاوانانە بکەن کە ئەوان بەردەوام ئەیکەن..

( کەواتە یـەك بەدوای یەکی ئەم ئایەتانەو بەشەکانی ئایەتەکـەش بەحسابەو لەپێشدا گوێگرتنەو بەدڵ وەرگرتنەو ڕازی بوونەوئنجا کرداری خراپ وتاوانە)٠

ئـەوەش کـە وتمـان کەسـێك بەشـێك لەئایـەتێك بـەجیا لـە دەوروبەرەکـەی وەردەگرێت، وەك ئەو کەسەی کە ئایەتی( ويل للمصلين) بەتەنها دێنێ کـە نابێت وهەڵەیە، چونکە کام لـەنوێژ خوێنان وەیلیان بۆ هەیە، دوای ئایەتەکە تەواوی دەکات کە ئەویش ئەوانەن نوێژەکانیان لەکاتی خۆیاندا ناکەن ( الذين هُمْ عَنْ صَلاتِهِمْ سَاهُونَ) (الماعون:٥)

**بنەمای دوانزەیەم/ دژایەتی نی یە لەنێوان ئایەتەکانی قورئان دا :**

ئەگەر بەچاکی وردبینەوە لـەقورئان ، دەبینـین جیـاوازی ودژایـەتی وناتـەوای نی‌یە لـە ئایەتـەکانی قورئاندا ،خوای پەروەردگار دەفەرموێت (أَفَلا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلافاً كَثِيراً) (النساء:٨٢) واتە/ ئەوە بۆ سەرنجی قورئان نادەن ولێی وردنابنەوە؟ خۆ ئەگەر لەلایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگە لـەخوا بێگومـان جیـاوازی ودژایەتی‌یـەکی زۆریـان تێـدا دەدۆزیەوە...بۆنموونە :

**یەکەم/** خوای گەورە دەفەرموێت ( وَإِنْ تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا هَذِهِ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَإِنْ تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا هَذِهِ مِنْ عِنْدِكَ قُلْ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ فَمَالِ هَؤُلاءِ الْقَوْمِ لا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثاً ، مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ وَأَرْسَلْنَاكَ لِلنَّاسِ رَسُولاً وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيداً ) (النساء:٧٨) **واتە/ ئەگەر خێریان بێتە ڕێ دەڵێن : ئەمە لەلایەن خواوەیەو، ئەگەر تووشی ناخۆشی وزیانێك بن( دووڕووەكان بۆ سووك كردنی حەزرەت(ص) لەبەرچاوی موسڵمانان ) دەڵێن: ئەمە بەهۆی تۆوەیە( هەروەك حەزرەت(ص) حەكیم نەبێ‌ونەزانێ چۆن ڕەفتاربكات وخەڵكی بەڕێوە ببات).. جاتۆ پێیان بڵێ:هەرچی پێشدێت ، هەر هەمووی لەلایەن خواوەیەو بۆ تاقی كردنەوەیە، ئەوە بۆچی ئەو خەڵكە ( باوەڕلاوازە) هیچ شتێك تێناگەن ولەڕاستی‌یەكان حاڵی نابن( ئەمە ڕاستی‌یەكە ئەبێ‌هەموو كەسێك بیزانێ كە هیچ شتێك لەم بونەوەرەدا بەبێ ویستی خوا ڕوونادات ، (**قل كل من عند الله**) بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ كەمروڤ ویستی نی‌یەو هەرچی بكات بەرپرس نی‌یە لێ‌ی،چونكە هەر ویستی خوایە كە ئیرادەی داوە بەمرۆڤ تا چاك وخراپ هەڵبژێرێ و ئنجا لێپرسراویش بێت بەرامبەر كارەكانی، بۆیە دەفەرموێت** (مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ وَأَرْسَلْنَاكَ لِلنَّاسِ رَسُولاً وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيداً)النساء٧٩

**واتە/ هەرچی بۆ تۆ پێشدێت لەخێرو چاكە لەخواوەیەو فەزڵی ئەوەو ، هەرچی ناخۆشی‌وموسیبەتێكیش تووش دێیت، دەستی خۆتی تیایەو، ئێمە تۆمان ناردووە بۆ سەرخەڵكی بەپێغەمبەرایەتی، خواش بەسە كە شایەتە لەسەر ئەو ڕاستی‌یە...**

**بەڵێ.. بەلاو موسیبەت وناخۆشی قەزاو قەدەری خوایە، بەلام هەیەتی بەهۆی گوناهی مرۆڤەكەوەیە وتەمێ‌كردنی خوایە بۆی، هەیە لەبەر پەروردەكردن**

وقـالْكردنى ئـەو مرۆڤەيـەو تـاقى كردنەوەيـە بـۆى، بۆيـە لەسـورەتى ( الشورى/٣٠)دا دەفەرمويْت( وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ) (الشورى:٣٠) واتـە/ هـەر بەلاَو نەهامەتىيەكتان بەسـەرهاتبيْت ، ئـەوە دەرەنجامى ئـەو كـارو كردەوانەيـە كـە دەتـانكرد، بـەلاَم ئـەوەندە خـوا ميهرەبانە، لەزۆربەى گوناهو هەلّەكانتان خۆش دەبيْت...

جائەگەر خوا چاو پۆشى نەكات ولەسەر هـەموو گوناهو هەلّەيەك سزا بدات و بەلاّ بنيْريْت، هيچ كەسيْك بەسەر زەوىيەوە نامينىْ ( وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَرَكَ عَلَى ظَهْرِهَا مِنْ دَابَّةٍ وَلَكِنْ يُؤَخِّرُهُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِ بَصِيراً) (فاطر:٤٥)

دووەم/ خواى پەروەردگار لەمەسەلەى هيْنانى زياتر لەيەك ژن دا دەفەرمويْت:
( وَآتُوا الْيَتَامَى أَمْوَالَهُمْ وَلا تَتَبَدَّلُوا الْخَبِيثَ بِالطَّيِّبِ وَلا تَأْكُلُوا أَمْوَالَهُمْ إِلَى أَمْوَالِكُمْ إِنَّهُ كَانَ حُوباً كَبِيراً) (النساء:٢)

واتـە/ خـەلْكينـە مـالْ وسامانى هـەتيوان بدەنـەوە دەسـت خۆيـان كـاتيْك گـەورە بوون ، مالّى خراپ وپيسى خۆتان مەگۆرِنەوە بەمالّى چاك وپاكى ئەوان، مالْ وسامانيان مەخۆن لەگەلْ مالْ وسامانى خۆتاندا، بەراستى ئەگەر وابكەن ئەوە ستەم وگوناهيْكى گەورەيە ( وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلَّا تَعُولُوا) (النساء:٣) واتە/ ئەگەر ترسان لەوەى كە نـەتوانن داد پـەروەربن لەگـەلْ كچـە بىْباوكـەكاندا ( ئەگـەر بيـانخوازن و بيانكەنـە هاوسـەرتان ) ، ئـەوە واز لـەوان بـهيْنن - چونكـە كەسـى وا هـەبوو لەبـەر بـەرژەوەندى خـۆى ومـالْ وسـامانەكەى كچـە بىْباوكـەكەى دەهيْنـا- ئـەوە لـە ئافرەتانى تر كە حەلاَلّن بۆتان ژن مارە بكەن دوو، يان سيان يان چوار، ( ديارە هيْنانى لەيەك ئافرەت زياتر مەرج وبارودۆخى تايبەتى خـۆى هەيـە) خۆ ئەگەر

ترسان لەوەی کە نەتوانن داد پەروەری بکەن لەنێوان هاوسەرەکانتاندا، ئەوە یەك ژن مارە بکەن، یان ئەو کەنیزەکانەی کەهەتانن( کەدیاردەیەکی کاتی بوو، ئیسلام بن بڕی کرد)، ئەوەی کە باسکرا نزیکترە لەوەی کە ستەم نەکەن...

ئنجا خوای گەورە لە ئایەتی١٢٩ی سوورەتی النساء دا دەفەرموێت :( وَلَـنْ تَسْتَطِيعُوا أَنْ تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَـاءِ وَلَـوْ حَرَصْتُـمْ فَـلا تَمِيلُـوا كُـلَّ الْمَيْـلِ فَتَذَرُوهَـا كَالْمُعَلَّقَةِ وَإِنْ تُصْلِحُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُوراً رَحِيماً) (النساء:١٢٩)

واتە/ هەگیز ئێوە ناتوانن لەنێوان هاوسەرەکانتاندا دادپەروەرانە ڕەفتار بکەن، لەکاتێك دا ئەگەر زۆریش مەبەستتان بێت ، جا کەوا بوو نەکەن هەر ڕوو لەیەکێکیان بکەن و بە تەواویی ئەوی تر واز لێبهێنن وەکو هەڵپەسێرراو، نە ئەوەیە مێردار بێت، نە ئەوەیە بێمێرد بێت، خۆ ئەگەر چا کسازی بکەن وڕێك بکەون وخۆتان بپارێزن لە ستەم ، ئەوە بەڕاستی خوا هەمیشە وبەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە ..

هەندێ کەس ئەمە دەکا بە بیانوو گوایەکەس ناتوانێ دادپەروەردی بکات لەنێوان هاوسەرەکانی دا کەواتە کەس ناتوانێ لەیەك ژن زیاتر بێنێ.... لەکاتێك دا ئەوەی کە داواکراوە لە دادپەروەری لەگەڵ هاوسەرەکاندا دادپەروەری ماددی‌یە، واتە وەکو یەك هەموو شتێکیان بۆ دابین بکات، ئەمەش کە لە دووەم جاردا، باسی دەکات، مەسەلەی هەست وسۆزو خۆشەویستی‌یە کە ئەوەش پەیوەندی بەدڵەوە ..

پێغەمبەر(ص) عائیشەی لە هەمووان زیاتر خۆش ویستووەو لەهەمان کاتیش دا هەرچی بۆ یەکێکیان دابین کردبێ بۆ ئەوانی تریشی دابین دەکردو وەك یەك لایان دەمایەوە ، تەنانەت لە نەخۆشی‌یەکەی دوایی تەمەنی‌دا ئیجازەی خواست لەخێزانەکانی کە لەلای عائیشە خزمەت بکرێت ، ئەوانیش ڕازی بوون....

حەزرەت(ص) دادپەروەر بوو ، هەرچی لە توانای دابوو کردی ئینجا دوعاشی دەکـردوو دەیفـەرموو: خوایـە ئەمـەم لەدەسـت دێ کـە کردوومـە بەرامبـەر خێزانـەکانم وبەدەسـت منـە، لۆمـەم مەکـەو لێـم مـەگرە لـەوەی کـە بەدەسـت تۆیە(واتە ئەو زیادە خۆشەویستیەی کە بۆ یەکێکیان هەیەتی ولە دڵەوەیـە، دیـارە دڵیـش بەدەسـتی پـەروەردگارە چـۆن هەڵیسـوڕێنیْ)... کەواتــە ئــەو دووئایەتـە لـەو باسـەدا دژایـەتی نیـە لـەنێوانیانداو بەسـەیر کردنـی ژیـانی حەزرەت(ص) باشتر تیْی دەگەین .

## بنەمای سیانزەیەم/ نەبوونی دژایەتی لەنێوان قورئـان وزانسـتێکدا کە سەلمابێت وگومانی تیانەبێت....

لەقورئاندا حەوت سەدو هەشت جار وشەی زانست و هاوماناکانی باسکراوە، ئەمـەش ئـەوە ناگەیـەنیْ بلێـین قورئـان پـەڕاوێکی زانسـتی‌یەو بـەس، بـەڵکو دەسـتووری میللەتانـە، یاسـاو دەوڵەتـە ، موعجیزەی‌پەیامێکـە، ژیانـە بـۆ مرۆڤایەتی، جاکاتێك قورئان ئامـاژە بـۆ لایەنـە زانسـتی‌یەکان دەکـات، ئەوا خوای گەورە دەیەوێت ئەو مرۆڤە هان بدات بۆ بیرکردنەوە لە ئایەتـەکانی خـۆی لـە بیسـتراوو بینـراو، واتـە چ ئـەوەی کـە لـە قورئانـدایـەو چ ئەوانـەش کـە لـە بوونەوەردایە( سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) (فصلت:٥٣) لێرەدا قورئان ئاماژە بەوە دەکات کە سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێت بۆ ئەوەی کە ئایەتـەکانی خـوا لەهـەموو ئاستەکاندا، لەهەموو ئاسۆکانداو لە هەموو بوارەکاندا بەڵگەن لـەسەر ڕاستێتی ئەم قورئانە..

قورئان دەیەوێت مرۆڤ تێبگات کە هەرچەند هەوڵ بدات هێشتا هەرکەمە چونکە ( وما أوتیتم من العلم ألا قلیلا ) الإسراء٨٥ ، وەهانی ئەدات کەداوا لەخوابکات زانستی زیاد بکات (وقلّ ربّ زدني علما) طه/١١٤

لەقورئاندا باسی پلەو پایەی بەرزی زانایان کراوەو خوای گەورە باسی شایەتی‌یەکەیان دەکات لەگەڵ خۆی ومەلائیکەتانی داو دەفەرموێت(شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِماً بِالْقِسْطِ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ) (آل عمران:١٨) هەروەها زانایانن کە بەڕاستی لەخوادەترسن ( إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ) (فاطر:٢٨)

جا لەبەر ئەوەی کە زانست وزانایان ئەوەندە پلەو پایەیان لە ئیسلامدا بەرزو دیاری‌یە، دیارە بەرنامەکەشی دژایەتی نابێت لەگەڵ ئەو ڕاستیە زانستی‌یانەی کەدەدۆزرێنەوە ..بۆنموونە :

**یەکەم/** نهێنی وڕاستی‌یەکانی زانستی کۆرپەلە زانی لەسەدەی نۆزدەیەم وبیستەمدا دۆزرانەوە ، ئەویش بەهۆی دۆزینەوەی (وردبینی‌ئەلیکترۆنی) و ئەو هۆکارانەوە کە باشتر دەیانتوانی‌لێکۆڵینەوەی پی‌بکەن... قورئان پێش هەزارو چوارسەد ساڵ زیاتر کە هیچ کەس لەدنیادا لەو بارەیەوە هیچی نەزانیوە باسی قۆناغەکانی کۆرپەلە دەکات و پاش بەراورد کردنی لەلایەن زانا گەورەکانی جیهانەوە ، دەرکەوت کە لەسەدا سەد تەواوەو بووە مایەی موسڵمانی بوونی زانای گەورەی کۆرپەلەزانی زانکۆی تۆرنتۆی کەنەدا ( پرۆفیسۆر کیث. ل. مور) (کە یەکێکە لە دوانزە زانا پسپۆڕە گەورەکانی ئەو بوارە لە جیهاندا ) و چەندەها زانای تر..

ا- قورئان دەفەرموێت (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى (الحجرات:١٣) واتە/ ئەی خەڵکینە بە دڵنیایی‌یەوە بزانن کە ئێمە ئێوەمان لەنێرو مێ دروستکردووە، هەروەها دەفەرموێت(إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ

أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعاً بَصِيراً) (الانسان:٢)واته/ ئێمه مرۆڤمان له نوتفەیەکی تێکەڵاو دروستکردووەو تاقی دەکەینەوەو چاووگوێمان داوەتێ...

ب- (الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنْسَانِ مِنْ طِينٍ ، ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِنْ سُلالَةٍ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ) (السجدة:٨) واته/ ئەو پەروەردگارە هەموو شتێکی به وردەکاری تەواوە دروستکردووەو مرۆڤیشی یەکەمجار( لەسەرەتاوە) لەگڵ دروستکرد(( زانای کۆرپەلە زانی ئەمریکی مارشاڵ جونسون - کە ئەمیش موسڵمان بوو - لەیەکێك لە کۆنگرە زانستییەکاندا وتی: زانایانی کیمیا لەم بابەتەیان کۆڵیەوەو بۆیان دەرکەوت کە گڵ نزیکترین ماددەیە لەپێکهاتنی لەشی مرۆڤ وگونجاوترین ماددەشە بۆ پەیدابوونی ژیان لێیەوە )) پاشانیش نەوەکانی لەپوختەیەکی ئاوێکی کەمەوە دروست دەکات ( لەپیاوولەئافرەت).

**دووەم/** خوای پەروەردگار سوێند بەشوێن وجێگەی ئەستێرەکان دەخوات ودەفەرموێ( فَلا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ, وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ) (الواقعة:٧٦)بەڵێ: ئەوە سوێندێکی گەورەیەئەگەر بزانن، ئەمڕۆ زانایان زۆر لەجاران زیاتر بەدڵنیاییەوە لە گەورەیی ئەو سوێندە تێدەگەن وسەری ڕێزی بۆ دائەنەوێنن . کە ئەمەش بەڕاستی ئیعجازێکی زانستی گەورەی قورئانە،،..

**سێیەم/** قورئان باسی ئەستێرە پرشنگدارو نزیکەکەی زەویمان دەکات کە ئەویش خۆرەو سەرچاوەی گەرمی ورووناکی یە بۆ کۆمەڵەی خۆر، کە چۆن ڕۆژێك لەڕۆژان نامێنێت و دەکوژێتەوە(إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ) (التكوير:١) ئەم ڕاستیەش ئەمڕۆ لەهەموو کات زیاتر زانایان بڕوایان پێیەتی ودەڵێن ڕۆژێك دێت خۆر نامێنێت وگڕوگەرمی ورووناکییەکەی دەکوژێتەوەو هەروەها ڕۆژێك دێت کەلگەڵ مانگدا یەکدەگرێتەوە (فاذا بَرق البصر وخسف القمر وُجمِع الشمسُ والقمر ) القيامة /٩(...سەرچاوە(هەیڤ١، ٢، ٣)ساڵی٢٠٠٣.

**چوارەم** / قورئان دەفەرموویت : ( حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ )(المائدة:٣)

واتە/ لەسەرتان حەرامکراوە خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو، خوێن، گۆشتی بەراز، هەروەها ئەومالآتەش کە سەردەبڕێن و ناوی غەیری خوای لەسەر دەبرێت ومالآتی خنکاویش، ئەوەش بەئازارو لێدان مردار بۆتەوە، ئەوەش کە دەکەوێتە خوارەوە، ئەوەش کە بەلێدانی مالآتێکی تر مردار بوویێتەوە، ئەوانەش کە دڕندە پەلاماری دابن ولێی خواردبن ئەگەر فریای چەقۆ نەکەوتبن، هەروەها حەرامکراوە خواردنیگۆشتی ئەومالآتانەی لەو شوێنانەدا سەردەبڕێن کە هاناو هاواری بۆ غەیری خوا تێدا دەبرێت...

ئەم ئایەتانە زانستی سەردەم دەیانسەلمێنێت ..ئەوەتا لەم بارەیەوە پرسیار کرا لە ( دکتور جون هونفر لارسن ) گەورە پزیشکی خەستەخانەی ڕەسمی لە کوبنهاگن و مامۆستای بەشی بەکتریا لە نەخۆشخانەی غیس کە گەورەترین نەخۆشخانەی هەمان شارە ، لە وەلآمدا وتی :

گۆشتی مردارەوەبوو سەرچاوەو کانگای جراثیم ونەخۆشییە و گۆشتی بەرازیش من تازە جرثومی( پارسینا ) م تیادۆزیوەتەوەو هەلمەتێکی فراوانم دەست پێکردووە بۆ قەدەغەکردنی خواردنی ، چونکە دەبێتە مایەی تووش بوون بە نەخۆشی بڕبڕەی پشت و جومگەکان ..

هەروەهامەڕو مالآتێکیش کە خنکابێت یان مالآتێکی تر لێی دابێت ، یان مالآتێك دڕندەیەك پەلاماری دابێت ولێی خواردبێت ،یان کەوتبنە خوارەوەومرداربووبنەوەو فریای چەقۆ نەکەوتبن هەر هەموویان مایەی نەخۆشین و نابێت بخورێن ..مجلة الاعجاز / ژمارە /٤ ..

**پێنجەم** / قورئان هانی دایك دەدات دووساڵ شیربدات بەمنداڵەکی ئەگەر توانی ( والوالدات يُرضعن اولادهن حولين كاملين لمن اراد ان يُتم الرضاعة ) پەڕاوی نلسون کەیەکێکە لەسەرچاوە بە ناوبانگەکانی (طب الاطفال ) لە چاپی ١٩٩٤ دا جەخت دەکاتە سەر گرنگی شیری دایك وداوا دەکات کەماوەیەکی باش شیر بەمنداڵ بدرێت .. الاعجاز / ژمارە /٤

**بنەمای چواردەیەم/ وردبونەوە لەکورتبڕی قورئان :**

قورئان لەبەر گەلێ هۆی پەروەردەییوجوانی داڕشتن بەپێی پێویست کورتکردنەوە دەکات، کە ئەمەش زۆر جۆری هەیە وەك:

١- لابردنی(اسم المضاف) وەك( حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ )(المائدة:٣)

لێرەدا ووشەی (أكل) لابراوە( حرمت عليكم أكل الميتة والدم .....هتد)

٢- لابردنی(مضاف اليه): (الم ،غلبت الروم ، فِي ادنى الارض وهم من بعد غلبهم سيغلبون في بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ بنصر الله ينصر من يشاء وهو العزيز الرحيم) الروم ٥ / لێرەدا ئەگەر کورت نەکرایەتەوە ئاوا دەبوو( لله الأمر من قبل الغلب ومن بعد الغلب)...واتە: ئەلیف لام میم ، ڕۆمەکان تێکشکێنران( بەدەستی فارسەکان)، لە نزیکتین ونزمترین وڵاتیانداو، لە ئایندەدا نۆرەیان دێتەوەو دوای شکانیان ڕۆمەکان سەرکەوتنەوە ، لەچەندساڵێکدا، هەموو کارو فرمانێك تەنها بەدەست خوایە، ( لەپێش سەرکەوتن ولەدوایسەرکەوتن ) جا ئەو ڕۆژە ئیماندارانیش خۆشحاڵ وشادمان دەبن بە سەرکەوتنی خوا ، (کە بەخشی بەئیماندار و ڕۆمەکان)، هەرکەسێك یان هەردەستەیەك ئەو زاتە بیەوێت سەری دەخات، هەر ئەو خوایەش خاوەنی دەسەڵاتی بێسنوورەو زۆریش میهرەبانە...

(خوای گەورە پاش ئەو چەند ساڵە نەك هەر ڕۆمەکانی سەرخست، بەڵکو لە هەمان کاتی سەرکەوتنی ڕۆمەکاندا دڵی موسڵمانەکانیشی خۆشکرد بە سەرکەوتنیان لەجەنگی بەدردا ، کە دیارە ئەمەش هەواڵدان بوو بە داهاتوو کە تەنها خوا بۆ خۆی زانیویەتی کە وادەبێت ) ..

٣- لابردنی(اسم الموصول): ( وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَأُنْزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَهُنَا وَإِلَهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ) (العنكبوت:٤٦)/ ئەگەر (اسم الموصول) لانەبرایە ئاواد ەبوو ( وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَبِالَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ)... واتە پێیان بڵێ، ئێمە بڕوامان هەیە بەوەی کە بۆئێوە هاتووەو بەوەش کە بۆ ئێوە نێردراوەو خوای ئێمەو ئێوە یەکێکەو، ئێمە بڕوامان پێیەتی وموسڵمان بووین وفەرمانبەرداری دەکەین .

٤- لابردنی( الموصوف) ( وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُدَ مِنَّا فَضْلاً يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ أَنِ اعْمَلْ (دروعا)سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ وَاعْمَلُوا صَالِحاً إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ) (سبأ:١١)

لێرەدا(دروعا) لابراوە، ماناکەشی / بەخوا ، بەڕاستی ئێمە ڕێزو بایەخێکی زۆرمان بەخشی بەداوود لەلایەن خۆمانەوە، (فەرمانمان دا): ئەی کێوەکان وباڵندەکان تەسبیحات وسروودی ستایشی لەگەڵدا بڵێنەوە ، هەروەها ئاسنیشمان بۆ نەرم کرد ( وەکو موعجیزەیەك ، تاپێداویستیەکانی بەئاسانی لێ دروست بکات لەزریپۆش وشتی تر ) ..

٥- لابردنی( المعطوف)

(وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لا يَسْتَوِي مِنْكُمْ مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِنَ الَّذِينَ أَنْفَقُوا مِنْ بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلّاً وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ) (الحديد:١٠) بەبێ لابردن ئاوایە(لا يَسْتَوِي مِنْكُمْ مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ، ومن أنفق من بعد الفتح وقاتل)...

واته/ بێگومان چوونیەك نین ئەوانەتان کەپێش ڕزگاریی مەککە، یاخود پێش سەرکەوتن، ماڵ وسامانیبەخشیوەوجەنگاوە، چونکە ئەوانە پلەو پایەیان زۆر بەرزترە لەوانەی کە دوای ڕزگاری مەککەو سەرکەوتن ماڵ وسامانیان بەخشیوەو جەنگاون، بەهەردوولاشیان خوا بەڵێنی بەهەشتی بەخشیوە، بێگومان ئەو خوایە ئاگاداری کردەوەکانتانە .

٦-لابردنی( المعطوف علیه)

(وَإِذِ اسْتَسْقَى مُوسَى لِقَوْمِهِ فَقُلْنَا اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْحَجَرَ= فضرب بعصاه الحجر = فَانْفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَشْرَبَهُمْ كُلُوا وَاشْرَبُوا مِنْ رِزْقِ اللَّهِ وَلا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ) (البقرة:٦٠) /لێرەدا( فضرب بعصاه الحجر )لابراوە..، واتە : یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێك موسا بۆ گەلەکەی داوای باران بارینی کرد، ئێمەش پێمان وت: بەگۆچانەکەت بدە بەتاشە بەردەکەدا، ( جاکەعەساکەی دا بە بەردەکەدا) دوانزە کانی لێهەڵقولاً، بێگومان هەر هۆزێك چاوگەیخۆی ناسی، ئنجا پێمان وتن دەبخۆن وبخۆنەوە لە ڕزق وڕۆزیو بەخششی خواو تاوان وخراپە مەکەن لەسەر زەویدا...

٧-لابردنی(المبتدأ) ( وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ ، فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ ، نَارٌ حَامِيَةٌ) (القارعة:١١) لێرەدا(هی)کە (مبتدا)ە لابراوەو ئایەتەکە بەبێ لابردن (هي نارحامیة) واتە: ئەوەی تەرازووی چاکەی سووك بێت وگوناهی زۆربێت، ئەوە دایکی دۆزەخە کە باوەشی بۆ کردۆتەوە ، جا تۆ چوزانی(هاویە)چییە؟! ئاگرێکی سوتێنەری بڵێسەدارە...

٨-لابردنی( الخبر)( مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى الَّذِينَ اتَّقَوْا وَعُقْبَى الْكَافِرِينَ النَّارُ) (الرعد:٣٥)ئەوەی کەلابراوە (وظلها دائم)... واتە :وێنەو نموونەی ئەو بەهەشتەی بەڵێن دراوە بە پارێزکاران، چەندەها ڕووبار ڕەوان وجاریە ( بەژێردرەختەکان وبە بەردەم

کۆشکەکانیاندا) ، خواردن وخواردنەوەی(هەمەجۆروهەمەڕەنگی)بەردەوام، هاوڕێ لەگەڵ سێبەری خۆش و(هەوای سازگار) ئەوەیە سەرەنجامی پارێزکاران و ، سەرەنجامی بێباوەڕانیش ئاگری دۆزەخە ..

٩-لابردنی(لا النافیه):

( قَالُوا تَاللَّهِ تَفْتَأُ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّى تَكُونَ حَرَضاً أَوْ تَكُونَ مِنَ الْهَالِكِينَ) (یوسف:٨٥) دەبوو( لا تَفْتَأُ ) بوایە، کە بەمانای (لاتزال)ە ،( واتە / بەردەوام باسی یوسف دەکەیت )و -لا - لابراوە ..

( ئەم وشەیەش - تَفْتَأُ - بەحساب دانراوە کە چەند مانایەکی هەیە وهەموو ماناکانیش پێویستن لێرەدا )... واتای ئایەتەکەش: کوڕەکانی یەعقوب(سەلامی خوای لێبێت) بەباوکیان ووت: بەخوا تۆ هەر واز ناهێنیت ویادی یوسف دەکەیت وناوی دەبەیت ودڵت ناسرەوێ وئاگری دەروونت ناکوژێتەوە ،تاوات لێدێت پەکت دەکەوێت یاخود لەتیا چووان دەبیت...

١٠-لابردنی(لام الطلب)

(قُلْ لِعِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا يُقِيمُوا الصَّلاةَ وَيُنْفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرّاً وَعَلانِيَةً مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ يَوْمٌ لا بَيْعٌ فِيهِ وَلا خِلالٌ) (ابراهیم:٣١)/ پیتی(لام)ی(طلب) ئەگەر لانەبرایە ئاوا دەبوو( لیقیموا الصلاة وینفقوا).. واتە/ ئەی محمد(ص) بەو بەندانەم کە باوەڕیان هێناوە بڵێ: بانوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام بدەن ولەو ڕزق و ڕۆزیەی کەپێمان بەخشیون ببەخشن بەنهێنی ، ( بۆ ئەوەی ڕیاو ڕووپامایی تێکەڵ نەبێت)و، بەئاشکراش( بۆ هاندانی کەسانی تر) پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت نە کڕینی تێدایەو ، نەفرۆشتن ( تا بەهۆی پارەو سامانەوەخۆتان دەرباز بکەن ) نە دۆستایەتیشی تێدایە ( تادۆستان وهاوەڵان هەوڵێك بدەن )....

١١- لابردنی(جملة القسم):
( وَتَفَقَّدَ الطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِيَ لا أَرَى الْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ الْغَائِبِينَ ، لَأُعَذِّبَنَّهُ عَذَاباً شَدِيداً أَوْ لَأَذْبَحَنَّهُ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ) (النمل:٢١) **لێرەدا بەبێ لابردن ئاوا دەردەچێت**(اقسم بالله لأعذبنه)**واتە/ ئینجا سولەیمان کەوتە بەسەرکردنەوەو پشکنینی دەستەوتاقمی باڵندەکان و ووتی: ئەوە بۆچیمن پەپوو نابینم؟ یاخود لێرەنیەو خۆی دزیوەتەوەو لەنادیارەکانە !(سوێند بێت بەخوا)ئەبێت سزایەکیزۆر سەختی بدەم یان سەری ببڕم ، یان دەبێت بە بەڵگەیەکی ئاشکراوە بێتە لام...**

**١٢- لابردنی (جواب القسم):**
(والنازعات غرقا، والناشطات نشطا، والسابحات سبحا، فالسابقات سبقا، فالمُدَبرات أمرا)النازعات٥/
**وەلامی ئەم سوێندانە** ( لَتُبعَثُنَّ ولتُحاسَبُنَّ ) **یە.. واتە: سوێند بەو فریشتانەی کە گیانی خەڵکی دەکێشن،( یان بەو ئەستێرانەی کە لەقولایی ئاسماندا دەدرەوشێنەوە)، سوێند بەوفریشتانەی کە گیانی ئیمانداران ددکێشن بە چالاکی وبێوچان دەسوڕێنەوە( کەس فەراموش ناکەن)، سوێند بەو فریشتانەی کە بە گورجی فەرمانی خوا جێبەجێ دەکەن( یان بەو ئەستێرانەی کەلە بۆشایی ئاسماندا مەلەدەکەن ولەسەر خولگەکانیان دەسوڕێنەوە)، هەروەها سوێند بەوفریشتانەی کە ڕۆحی ئیمانداران بەپەلە بە بەهەشت شاد ددکەن و کافرانیش بە دۆزەخ وپێشبڕکێ دەکەن بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك کەپێیان بسپێردرێ و...سوێند بەو فریشتانەش کە بەویستی خوا کارو فرمان جێبەجێدەکەن بەڕێك وپێکی...( سوێند بەوانە هەمووی زیندوو دەکرێنەوەو حسابتان لەگەڵ دەکرێ) ....**

(يَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ، تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ، قُلوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ،أبْصَارُهَا خَاشِعَةٌ) (النازعات٩) لەرۆژێكدا فوو دەكرێت بەكەڕەناداو؛ دەست بەجێ زەوی بەتوندی تەكان دەدات ودەكەوێتە لەرزەو ژێرەوژوور دەبێت، دوایی دووبارە فووی پیا دەكرێتەوە، مردووان زیندوو دەكرێنەوە، لەو ڕۆژەدا دڵانێك بەخێرایی‌لێدەدەن و، زۆر دەترسن وپەرێشانن، خاوەنی ئەو دڵانە لەڕیسوایی‌و خەجاڵەتی وشەرمەزاری‌دا چاویان شۆڕەو ڕوویان نایەت سەرهەڵبڕن...

١٣- لابردنی(جواب الشرط):

(وَإِنْ كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تَبْتَغِيَ نَفَقاً فِي الْأَرْضِ أَوْ سُلَّماً فِي السَّمَاءِ فَتَأْتِيَهُمْ بِآيَةٍ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى الْهُدَى فَلا تَكُونَنَّ مِنَ الْجَاهِلِينَ ) (الأنعام:٣٥)

ئەم ئایەتە بەبێ‌لابردن( فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تَبْتَغِيَ نَفَقاً فِي الْأَرْضِ أَوْ سُلَّماً فِي السَّمَاءِ- فأفعل- فتأتيهم بآية..)

واتە/ خۆ ئەگەر پشت هەڵكردن وسەرپێچی خوانەناسانت لاقورسە، ئەگەر دەتوانیت تونێلێك بەزەوی دا هەڵبكەنیت ؛ یا پەیژەیەك بەئاسماندا هەڵپەسێریت تاموعجیزەیەكیان بۆ بهێنیت(بێ‌سوودەو بڕوات پێ‌ناكەن)، ئەگەر خواش بیویستایە لەسەر هیدایەت كۆی دەكردنەوە، كەواتە لەو كەسانە مەبە كە نەشارەزان...

( واتە: ئەگەر دەتوانی موعجیزە بێنی بیهێنە، بەڵام بەوە موسڵمان نابن و، ئەگەر خوا بیەوێ بەزۆر ملیان پێ‌كەچ دەكات، بەڵام بە ئیرادەی خۆی سەرپشكی كردوون كەچاكە یا خراپە هەڵبژێرن ) .

١٤- لابردنی(جملة الشرط)

(يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ) (العنكبوت:٥٦)

ئەوەی لابراوە(فإیایّ فاعبدون فـي غیرها), واتە/ ئەی بەندەکانم کە بڕواتان هێناوە، زەوی من فراوانە(هیجرەت بکەن) بۆ ئەوەی بتوانن بە ئازادی من بپەرستن لە شوێنێکی تردا....

١٥- لابردنی زیاتر لەڕستەیەك:

أ- ( فقلنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَى وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ) (البقرة:٧٣)

بەبێ‌لابردن وادەردەچێ( فقلنا:اضربوا القتيل ببعض البقرة، فضربوه ببعضها فصار القتيل حيا، فقلنا: كذالك يحيى الله الموتى ويريكم آياته لعلكم تعقلون..)

واتە: وتمان: بە پارچەیەك لەو مانگا سەربڕاوە بدەن بە لاشەی کوژراوەکەدا ( دیارە بەویستی خوا وەك موعجیزەیەك کوژراوەکە زیندوو بۆتەوەو ڕاستی بکوژەکەی خۆی وتووە)جا ئا بەوشێوەیەو بە ئاسانی، خوا مردووان زیندوو دەکاتەوەو دەسەلاتی خۆیتان نیشان دەدات بۆ ئەوەی تێبگەن وژیر بن .

ب- هەروەها( وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَجَعَلْنَا مَعَهُ أَخَاهُ هَارُونَ وَزِيراً، فَقُلْنَا اذْهَبَا إِلَى الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَدَمَّرْنَاهُمْ تَدْمِيراً) (الفرقان:٣٦)

واتە/ سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لە کاتی خۆی تەوراتمان بەخشی بە موساو، هاروونی براشیمان کرد بە وەزیرو یاریدەدەری، ئەوسا پێمان وتن: هەردوکتان بچن بۆ سەر ئەو گەلەی کە ئایەتەکانی ئێمە بەدرۆ دەزانن وبڕوای پێناکەن( ئالێرەدا باسێکی زۆر کورت کراوەتەوە کەئەویش چوونی حەزرەتی موساو هارونە بۆ گەیاندنی پەیامی خواو پاش چەندەها ساڵ خەبات کردن، کەلەسوورەتەکانی ترداسەرگوزەشتەکەی باس کراوە)گەلی ستەمکارو دوور لەخوا لەناوبران و(فدمرناهم تدميرا)...

ج- ( قَدْ كَانَ لَكُمْ آيَةٌ فِي فِئَتَيْنِ الْتَقَتَا فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَأُخْرَى كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُمْ مِثْلَيْهِمْ رَأْيَ الْعَيْنِ وَاللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِ مَنْ يَشَاءُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِأُولِي الْأَبْصَارِ) (آل عمران:١٣) بەبێ‌لابردن ئاوادەردەچێت ( قَدْ كَانَ لَكُمْ آيَةٌ فِي فِئَتَيْنِ الْتَقَتَا فِئَةٌ (مؤمنة) تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَ(فئة)أُخْرَى كَافِرَةٌ(تقاتل فی‌سبيل الطاغوت) يَرَوْنَهُمْ مِثْلَيْهِمْ رَأْيَ الْعَيْنِ(بقضاءالله وبقدره ليؤيّدالفئةالمؤمنةبنصره) وَاللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِ مَنْ يَشَاءُ(فاعتبروا) إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِأُولِي الْأَبْصَارِ)

واتە/ بێگومان لەو دوو دەستەیەی کەلەجەنگی بەدردا ڕووبەڕووی یەك بوونەوە ،نیشانەو پەندێکی گەورەبوو بۆتان، دەستەیەکیان لەپێناوی خوادا دەجەنگان، دەستەکەی تریان بێباوەڕبوون، ئیمانداران لەبەرچاوی ئەواندا دووئەوەندەیاندا دەنواند لەمەیدانی جەنگدا، خوا فریشتەی دابەزاند بۆ یارمەتی بڕوادان، جا خوا پشتگیری هەرکەسێکی بوێت دەیکات، بەڕاستی ئاو لەو یارمەتی‌یەدا پەند هەیە بۆ ئەوانەی کە بیردەکەنەوەو بەصیرەتیان هەیەو زەینیان ڕوونە...

د- (أَفَمَنْ كَانَ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّهِ كَمَنْ زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ) (محمد:١٤) ئەمە کورتکراوەتەوەو ئەمەی لێ‌تێدەگەین(أَفَمَنْ كَانَ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّهِ واتبعواكتاب الله وصراطه ورسوله كما أمرهم الله ، كَمَنْ لم يكن على بينة من ربه وزَيّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ) ....

واتە/ئایا ئەو کەسەی کەلەلایەن پەروەردگاری‌یەوە بەڵگەو نیشانەی ڕوونی پێگەیشتووەو، باوەڕی‌دامەزراوی پێیەتی ولەسەری دەڕوات ، وەکو ئەو کەسە وایە کە کارو کردەوەی ناشیرین ونادروستی‌لەبەر چاو ڕازێنرابێتەوە، ئەو جۆرە کەسانە شوێنی ویست وئارەزوویان کەوتوون...

هـ- (وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ) (المائدة:٤٨)

فیعلی(اتَّبعَ)(علی)ی لەگەڵ دا بەکاردێ وئەوتریٚ(اتبعـهُ علـی مذهبـه)وه (فی) لەگەڵدا بەکاردێوئەبێ بە(اتبعه فی مذهبه) ، بەلاّم لەوەدا کە(عن)ی لەگەڵدا بەکار هاتووە، ئەوە مانایەکی تر لـەخۆی دەگرێت کە وای لێدێت(ولاتتبـع أهواءهـم منصرفـا عمّـا جـاءك مـن الحـقّ)واتـه/ ئێمە قورئانمـان هـاوڕێ لەگـەڵ هـەموو هەقیقەت وڕاستییەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕاستی ودروستی کتێبەکانی پێش خۆیشی دیاری دەکات وچاودێرە بەسـەر هـەموویاندا، بـەو بەرنامەیـەی خـوا ناردویـەتی داوەریـی بکـە لـە نێوانیـاندا ( کـاتێك ئـەهلی کیتـاب کێشـەکانیان دەهێننـە لات ) و شـوێن هـەواو ئارەزوویان مەکـەوەو لـەو حەقە لامـەدە کـە بـۆت ڕەوانە کراوە...

## بنەمای پانزەیەم/ مانای ووشە قورئانییەکان لەزمانی عەرەبیدا....

بۆ وردبوونەوە لەقورئان، دەبێت بگەڕێین بەدوای ماناکانی وشەیەکیقورئانی لە زمانی عەرەبیدا ، ئاخۆ کاتی خۆی عەرەب بە چ مانایـەك ئـەو وشـەیەی بـەکار هێنـاوە ، خـوای گـەورە لەزمانی عـەرەبیدا کـە پێـك هـاتووە لـە نزیکـەی دوانـزە هـەزار ڕەگ، تەنـها هەزاروحـەوت سـەد ڕەگـی هـەڵبژاردووەو بـەکاری هێنـاوەو بەهۆی قورئانیشـەوە ئەم ڕەگانە زیاتر بڵاو بوونەتەوەو بەکاردەهێنرێن...

**نموونەی یەکەم/** جاری واهەیە وشـەیەك لـە دوو شـوێندا بـەکارهاتووە بـە دوو مانای جیاواز، وەك وشەی ( بَلَی، يَبْلُو، نَبْلُو ) ...

أ- قورئان دەفەرموێت ( يَوْمَ تُبْلَى السرائِرْ)الطـارق٩:واتـه/ نهێنی و ئەسرار یان دەرئەخەین، ئیبن عومەر دەڵێ( خوای گەورە هـەموو نهێنییان ئاشکرا دەکات، ئەگەر باشبن لە ڕووی گەشیاندا دیارە ، ئەگەر خراپیش بن لـە ڕوو ڕەشی وگرژییاندا دیارە)

ب- هەروەها دەفەرموێت( وَلَنَبْلوَنَّكُمْ حَتَّى نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنْكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَ نَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ) (محمد:٣١) واتە: سوێند بەخوا دەتانخەینە بەر تاقیکردنەوە ، تالە جیهانی واقیعدا تێکۆشەروخۆڕاگرانتان دەربکەوێت وئاشکرا ببێت بۆمان ، بۆ ئەوەش بزانین دەنگو باستان چۆن دەبێ وتاقی بکەینەوە...

( کەواتە بەمانای ئاشکرا کردن وبەمانای تاقیکردنەوەش دێت کە لە هەر شوێنێکدا مانایەك دەگەیەنێت)

نموونەی دووەم/خوای پەروەردگار دەفەرموێت( وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا ) (النازعات:٣٠)

دحا الأرض : زەوی ڕاخستووەو فراوانی کردووە، هەروەها لەزمانی عەرەبیشدا بەوەدێت کەسێك بەردێك هەڵبدات وبەردەکە بڕوات یا بەدەوری خۆی دا بسوڕێتەوە... زانایانی تەفسیر بەوەی یەکەم تەفسیریان کردووە کە ماناکەی تەواوە و هەر کەس بەچاو سەیری زەوی بکات هەتا چاوی بڕبکات زەوی‌یەو خوای گەورە وەك فەرش بۆ ئەم ئادەمیزادەی ڕاخستووەو فراوانی کردووە، بەلاّم بەپێی زانیاری ئەمڕۆ کە دۆزراوەتەوە زەوی لەسەر خولگەی خۆی دەجولێ بەدەوری خۆرداو پاشان بەدەوری خۆشی‌دا کەواتە ئەم مانایەی تریش کە لە زمانی عەرەبی‌دا هەیە هەر ڕاست دەردەچێ‌و، زەوی وەك بەردێکی گەورە هەڵدرابێ ئاوا لەبۆشایی ئاسماندا بسوڕێتەوە....

## بنەمای‌شانزەیەم/ گەڕان بەدوای جیاوازی ئەو وشانەی کە لەیەك دەچن لە مانادا :

لەزمانی عەرەبی دا جاری واهەیە کۆمەڵێ وشە بەدەوری یەك مانادا دێن و دەچن ، بەلاّم جیاوازیش هەیە لە نێوانیانداو قورئان هەرکامێکیانی بەکار هێنابێ بەحساب وبەحیکمەت بەکاری هێناون...

**نموونەی یەکەم/** وشەی( الفقیر، المسكين) هاتووە لەچەند ئایەتێکی قورئانداو جیاوازی هەیە لەنێوانیاندا...

ا-الفقیر... کەسێکە هەژارەو پێویستی بەخەرجی‌یە بۆ خۆی ومالْ ومنالی، بەلاّم پێوەی دیار نی‌یەو ، کەسیٚ نەزانیٚ لەبەر شێوەو ڕەنگ ورووی ، وە قسە نەکردنی هەست ناکا هەژارە ، یان بە توانایەو ئیش دەکات ، وانازانریٚ موحتاجەو بەشی ناکات..

قورئان دەفەرموێت ( لِلْفُقَرَاءِ الَّذِينَ أُحْصِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ لا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْباً فِي الْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاءَ مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُمْ بِسِيمَاهُمْ لا يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافاً (البقرة:٢٧٣) واتە/ خێرو سەدەقات بدەن بەو هەژارانەی لەپێناو خوادا لێبڕاون وناتوانن بگەڕێن بەزەویدا بازرگانی وکاسبی بکەن( بەهۆی خەریك بوونیان بۆ گەیاندنی پەیامی خوایی)، ئەوەی نەیانناسێت، وادەزانێت دەوڵەمەندن ، تۆ ئەی پێغەمبەر(ص) بەڕەنگ ورووخسارو سیمایاندا دەیانناسیتەوە ، داواناکەن لەخەڵکیو، بەزۆر شت ناسەنن وخەڵکی ڕووگیر ناکەن، هەر خێرێك ئەنجام بدەن ئەوە بێگومان خوا زانایەپیٚ. هەروەها دەفەرموێت ( يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ) (فاطر:١٥) واتە/ خەڵکینە ئێوە هەژارو موحتاجی خوان وخوای گەورەیە دەوڵەمەندە وسوپاسکراوە...(واتە هەمووخەڵك هەژارن، ئەگەر دیاریش نەبیٚ پێیانەوە)

هەروەها جوولەکەکان بیٚ ئەدەبیان دەکردوو دەیان وت ( لَقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا وَقَتْلَهُمُ الْأَنْبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ) (آل عمران:١٨١)

واتە/ سوێند بێت بێگومان خوای پەروەردگار گوفتاری نابەجیٚ ئەو جوولەکانەی بیست کە وتیان: خوا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین، ئێمە ئەو

گوفتارانە یاداشت وتۆمار دەكەین لەسەریان ، هەروەها كوشتنی پێغەمبەران بە دەستی ئەوان بەناحەق( ئەویش تۆمار كراوە لە سەریان) لە دۆزەخیشدا پێیان دەڵێین: بچێژن سزای ئاگری سوتێنەر...

نەیان وت خوای گەورە(مسكین)ە، واتە هەژارەودیارە پێیەوە كە هەژارە، بەڵكو لەعنەتیان لێبێ وتیان خوا هەژارە هەرچەند هەژاری‌یەكەشی نادیارە...

هەروەها حەزرەتی موساش كەچوو بۆ مەدیەن فەرمووی ( فَسَقَى لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّى إِلَى الظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنْزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ) (القصص:٢٤)

واتە/ ئاوی مەڕوو ماڵاتەكەی بۆ دووئافرەتەكە داو، دوایی چووە ژێر سێبەرێكەوەو فەرمووی: پەروەردگارا بەڕاستی تۆ خێروبێری زۆرت بەسەردا ڕژاندووم، بەڵام هێشتا هەژارم وئاتاجی بەخششی زیاترم...

( دیارە هەژاری‌یەكەی خۆی لای خوا دەردەبڕێت وبۆ خەڵكی باس ناكات)

ب- ( المسكين) ئەو هەژارەیە كەپێوەی دیارە هەژارە ، بەوەی كە داوا دەكات، یان حاڵ وبارو زروفی دیارە كە نەبووەو نەدارایە...

قورئان دەفەرموێت( يَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنْفِقُونَ قُلْ مَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ خَيْرٍ فَلِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ) (البقرة:٢١٥) واتە/ لێت دەپرسن ئەی محمد(ص)كەچی ببەخشن، پێیان بڵێ: هەر خێرێك دەكەن سەرەتا دایك وباوكتان فەرامۆش مەكەن، هەروەها خزمان وهەتیوان وهەژاران ورێبوارانی نەداریش، هەر خێرو چاكەیەكیش ئەنجام دەدەن، دڵنیا بن كە خوا زاناوئاگادارە.( لێرەدا مەبەست ئەو هەژارانەیە كە دیارن) . هەروەها بۆ جوولەكەش دەفەرموێت( وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ وَالْمَسْكَنَةُ وَبَاءُوا بِغَضَبٍ مِنَ اللَّهِ )(البقرة:٦١) واتە/ جا بەهۆی لاساری وخراپیانەوە سووكی‌و ڕیسوایی ولاتی وزەبوونی‌وهەژاری‌یەك ( كەپێیانەوە دیارە یان خۆیان

وا دەردەخەن بۆ ئەوەی سۆزو بەزەیی خەڵك بەلای خۆیاندا ڕابکێشن)درا بەسەریانداو شایانی خەشم وقینی خواش بوون...

هەروەها لەبارەی سیفاتی ئەهلی دۆزەخەوە دەفەرموێت( وَلا يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ) (الحاقة:٣٤) واتە/(ئەو دۆزەخی یە) باوەڕی بەخوای گەورە نەبوو، هانی کەسی نەئەدا کەخواردن بدەن بەو هەژارانەی کە تەواو دیارە هەژارو نەدارن(واتە: بەچاوی خۆی ئەیبینین کەچی گوێی نەئەدانێ) و، نافەرموێ (على طعام الفقير) چونکە فەقیرەکە هەژاریەکەی دیار نیەو ڕەنگە گلەیی لەسەر نەکرێ وەکو ئەوەی کە(مسکین) ەو دیارە...

(الفقیرو المسکین) بەیەکیشەوە هاتوون( إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ) (التوبة:٦٠)

واتە/ بێگومان زەکات بۆ هەژاری‌دیارو نادیارو ئەو کەسانەی کە کارمەندن بەسەریەوەو بەو موسڵمانە نوێیانەی کە هێشتا دڵیان دانەمەزراوەو دڵیان ڕادەگیرێ وبۆ ئازاد کردنی کۆیلەکان ویارمەتی دانی قەرزارەکان وبۆ گەیاندنی ئاینی خواو هەروەها ئەو ڕێبوارانەش کەپارەیان لێدەبڕێت ونەداردەبن، دابەشکردنی زەکات بەو شێوەیە فەرزە لەلایەن خواوە لە گەردنی موسڵمانانندا، خواش زاناو دانایە.

**نموونەی دووەم/** لە قورئاندا وشەی(مس) و وشەی(اصاب) هاتووە، کە یەکەمیان بەرکەوتنێکی زۆر کەم و، دووەمیشیان یانی بەرکەوتنێکی زیاترو تووش بوونی شتێکی گەورەیە خێر بێ‌یان شەڕ، قورئان دەفەرموێت( إِنْ تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِنْ تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا بِهَا وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا لا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئاً إِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ) (آل عمران:١٢٠)

واتە/ ئەگەر کەمترین خۆشی ڕووتان تێبکات کافران پێیان ناخۆشەو، ئەگەر تووشی بەڵاو موسیبەت وناڕەحەتی‌یەکی گەورەش بوون دڵشاد دەبن، جائەگەر خۆگرو پارێزکاربن، پیلانی ئەوان هیچ زیانێکتان پێناگەیەنێت،چونکە بەڕاستی خوا دەوری پیلانیانی‌داوەو ئاگاداری هەموو کارو کردەوەو نەخشەیەکیانە .

**بنەمای حەڤدەیەم/ کاتێك دەقێکی قورئانی دەلالەت دەکاتە سەر دووشت یان زیاتر..**

جاری واهەیە دەقێکی قورئانی یان وشەیەکی دەلالەتێکی لەبنەڕەتی زماندا هەیەو، دەلالەتێکی تری هەیە لەعورفی عامدا، یان شتێکی بەرجەستەیەو بۆ شتی مەعنەوی بەکار هاتووە، جا پێویستە لێیان ووردبینەوەوشارەزای ببین:

**نموونەی یەکەم:** وشەی(المکر) لەقورئاندا هاتووەو لەزماندا بۆ ئەو پیلان وتەگبیرە بەکاردێت کە بەنهێنی‌دەکرێت ، خێربێ یان شەڕ ... پاشان وشەی(المکر) لەلای خەڵکی‌وعورفی عام بۆ پیلان وتەگبیری نهێنی شەڕ بەکار هات، بۆیە دەبێت لەتەفسیری ئەو ئایەتانەدا کە(مکر)ی تێدا هاتووە بچینەوە سەر بنەڕەتی زمان.. قورئان دەفەرموێت ( وَالَّذِينَ يَمْكُرُونَ السَّيِّئَاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَكْرُ أُولَئِكَ هُوَ يَبُورُ) (فاطر:١٠)

واتە/ ئەوانەی کەپیلانی خراپ دەگێڕن سزای زۆر توندوتیژ بۆیان ئامادەیە، پیلانی ئەوانە هەرخۆی پووچ دەبێتەوەو بێ‌بەرووبووم وناکامە..هەروەها ( اسْتِكْبَاراً فِي الْأَرْضِ وَمَكْرَ السَّيِّئِ وَلَا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ الْأَوَّلِينَ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَبْدِيلاً وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلاً) (فاطر:٤٣) واتە/ خۆیان بەزل وگەورە دەزانی لەزەویداو پیلانی شەڕو تاوانیان کێشا، بەمەرجێك پیلانی شەڕوتاوان تەنها بەسەر ئەوانەدا دەشکێتەوە کە نەخشەی بۆ دەکێشن، مەگەر ئەمانە بەدژایەتی ئیسلام تەنها چاوەڕێی ئەو

کارەساتانە بکەن کە بەسەر گەلانی پێش ئەمان دا هاتووە، (کاتێ بڕوایان بەپێغەمبەران نەهێناو لەناو بران) ئیتر تۆ نابینیت هەرگیز لەیاساو بەرنامەکانی خوادا گۆڕانکاری پێش بێت، هەرگیز نابینیت یاساو بەرنامەکانی خوا لە ڕێڕەوی خۆیان لابدەن( کەبەشێکی ڕیسواکردنی پیلانگێڕانە)...

لەم دووئایەتەدا بەئاشکرا(مکر)ی( السيء)ی جیا کردەوە لە(مکر)ی چاك... لە سورەتی (انفال)یشدا ئایەتی(٣٠)دەفەرموێت ( وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ) (الأنفال :٣٠) واتە/ ئەیمحمد(ص) یادی ئەو کاتە بکەرەوە، کاتێك ئەوانەی بێباوەڕ بوون پیلانیان دەگێڕا دژی تۆ بۆ ئەوەی بەندت بکەن، یان بتکوژن، یان دەرت بکەن، ئەوان پیلانی خۆیان دەگێڕن وخوایش پیلانی خۆیدەخاتە کار ( بەپووچ کردنەوەی کارەکانیان)، دڵنیابن خوای گەورە چاکترینی هەموو پیلانساز و نەخشە سازانە، نایەڵێ پیلانیان سەربگرێ...( پیلانەکانی خواش خێرە بۆ مرۆڤایەتی، کە لەناوبردنی خراپەکارانە )....

هەروەها لە سورەتی (النمل) ئایەتی ( ٥٢ )دا دەفەرمویٚ(وَمَكَرُوا مَكْراً وَمَكَرْنَا مَكْراً وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ, فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَاهُمْ وَقَوْمَهُمْ أَجْمَعِينَ، فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) واتە: لەهۆزی ( ثمود) نۆ دەستە هەبوون خراپکار، سوێندیان خوارد کە لە شەودا بدەن بەسەر حەزرەتی(صالح) داو خۆی وشوێنکەوتوانی لەناوبەرن، پاشان ئەگەر گومانیشیان لێکردن سوێند بخۆن کە ئاگایان لێ نییە ، ئەو تاوانبارانە پیلانیان دانا، ئێمەش نەخشەیەکی ترمان کێشا بۆ ڕزگار کردنی بڕواداران و لە ناوبردنی کافران ، ئەوان ئاگایان لێنەبوو، هەستیان پێنەدەکرد، جائیتر سەرنج بدەو تەماشاکە، سەرەنجامی پیلانەکەیان چییان بەسەرهات، بەڕاستی ئێمە نۆتاقمەکە وگەلەکەمان بەیەکەوە لەناو برد.. ئەوەتە ماڵەکانیان کاول وچۆڵە

بەهۆی ئەو ستەمەی کە کردیان، بەڕاستی ئا لەو بەسەرهاتەدا بەڵگەو نیشانەی تەواو هەیە بۆ کەسانێك کە لەشت تێبگەن وبزانن ..

**سەرنجێك**: پیلانی ژێر بەژێرو نهێنی دوژمنان هەرگیز بەرامبەر بەهەق تەواو نابێ، بەلام ئەبێ ئەوەمان لەبیرنەچێ کەخوای گەورە خاوەنی ئەم بوونەوەرەیەو بەرەلای نەکردووە هەرکەس چی دەکات بیکات، بەڵکو ئاگای لە هەموو ووردو درشتێك وئاشکراو نهێنی‌یەکە لەم بوونەوەرە بێ‌پایانەدا... جا ئەوانەی خەریکی ئەو کارانەن یەکسەر تۆمار دەکرێ لەسەریان وپاشان بەدژە پیلانی هەق لە پەروەردگاری بالادەستەوە تەخت وتاراجیان تێك ئەدرێت ، ئەو دەستە وتاقمە تیا دەچن ودەستەو تاقمێکی تر بەفیزەوە دێن خۆیان تاقی دەکەنەوەو بەهەمان ڕێبازی چەوتا دەڕۆن وئەمانیش هەمان سەرەنجامیان دەبێ( چونکە سوننەت وباوی خوا وایە لەم بوونەوەرەدا)، ئەمەش بەردەوام دەبێ تا قیامەت ، ئەوەتە قورئان دەفەرموێت ( وَإِذَا أَذَقْنَا النَّاسَ رَحْمَةً مِنْ بَعْدِ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُمْ إِذَا لَهُمْ مَكْرٌ فِي آيَاتِنَا قُلِ اللَّهُ أَسْرَعُ مَكْرًا إِنَّ رُسُلَنَا يَكْتُبُونَ مَا تَمْكُرُونَ) (یونس ٢١) واتە/ کاتێك خەلکی‌لە دوای ناخۆشی‌یەك کە بۆیان پێش دێت، لە ڕەحمەت وبەخششی خۆمان بەهرەوەریان دەکەین ، ئەوە یەکسەر پیلانگێڕی کاریانە دژ بەئاین وفەرمانەکانی ئێمە، ئەی محمد(ص) پێیان بڵێ:

خوا خێراترە لەوان لەنەخشەو پیلان دا، بەڕاستی(نەك هەر ئاگامان لێیانە) بەڵکو فریشتەکانمان هەموو پیلان وفێڵێکیان تۆمار دەکەن...(ئەمەش لەبەرئەوەی پیلان دانانی نهێنی قۆناغێکی‌سامناکە کە کافران دەیگەیەنێ)، بەلام گوناهکردن وخراپە کردن وهەندی‌قسە، مۆڵەتێك دەدرێن لە نووسیندا سا بەڵکو تەوبە بکەن، ئنجا دەنووسرێ چونکە مەترسی کەمترە، هەروەك دەفەرموێ( سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا وَقَتْلَهُمُ الْأَنْبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ) (آل عمران:١٨١)

(كَلَّا سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُ مِنَ الْعَذَابِ مَدّاً) (مريم:٧٩)

**نموونەی دووەم/** هەروەها قورئان وشەی(الأبواب) کە شتێکی بەرجەستەیە بەکاری دێنێ بۆ(دەرگای خێرو خۆشی) کە مەعنەوی یە....

(الظلمات و النور) تاریکیەکان ورووناکی، کە هەست پێکراوە بەکاری دێنێ بۆ تاریکایەکانی کوفرو نووری ئیمان کە مەعنەوین....

(الختم) کە مۆرکردنی ئاساییە ، بۆ مۆرکردنی دڵ ودەروون بەکارهێنراوە . ئەو بەکارهێنانەش زۆرن ، پێویستە ئاگاداریان بین بۆ تێگەیشتنی چاکتر لەئایەتەکانی قورئان..

خوای پەروەردگار دەفەموێت(حَتَّى إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَاباً ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ) (المؤمنون:٧٧)واتە/ کاتێك کەدەروازەی سزایەکی سەختیان لێدەکەینەوە ، ئیتر دەستبەجێ لەناویدا سەرگەردان وسەر لێشێواو و نائومێد دەبن.

هەروەها دەفەرموێت(خَتَمَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَعَلَى سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (البقرة:٧) ئەو بێباوەڕانە خوا مۆری ناوە بەدڵ وگوێیانداو پەردەی بەسەر چاویاندا هێناوە، نەبیردەکەنەوەو نەهەق دەبیستن، هەر بۆیە سزایەکی سەخت چاوەڕێیانە...(دیارە کۆمەڵێکی تایبەتن لە کافران، گەیشتونەتە قۆناغی مۆرکردنی دڵ وگوێ )..

**بنەمای هەژدەیەم/ کاتێك ئایەتێك کۆمەڵێ مانا دەگرێتەوە:**

کۆمەڵێ لەفوقەهاو ئوسولیەکان ڕایان لەسەرئەوەیە ئەگەر ئایەتێك زیاتر لەیەك مانای دابەستەوەودژایەتی نەبوو لە نێوانیانداو، بەڵگەیەك نەبوو کە بەلایەکدا ساغی بکاتەوە، ئەوا ماناکان دەکرێ هەموویان مەبەست بن...کەئەمەش جۆرێکە لە بەلاغەت.. لەو زانایانەش وەك( ئیمام مالیك)و(ئیمام شافیعی)و..هتد

**نموونەی یەکەم**/(قُتِلَ أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ ، النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ ، إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ، وَهُمْ عَلَى مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ، وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَنْ يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ) (البروج:٨)

**واتە/ بەکوشت چن ئەوانەی کە چاڵیان هەڵکەند بۆ بڕواداران، ئاگری داگیرساوو بەتینیان کردەوە، ئەوکاتەی کە بەدەوریدا دانیشتبوون، لە نزیکەوە چاودێری ئەو کارەساتەیان دەکرد کە بەسەر باوەڕداراندا دەهێنرا وخۆیان لەنزیکەوە سەرپەرشتی‌یان دەکرد، ئەم ڕق وداخەیان لەبڕواداران تەنها لەبەر ئەوەبوو کە ئەوان باوەڕیان دەهێنا بەخوای بالاّ دەستی شایستەی سوپاسگوزاری..**

**وشەی(نقموا) لەزمانی عەرەبی‌دا بەمانای ( عابَ) دێت یانی عەیبی لێ دەربێنێ ..**

**هەروەها بەمانای ( کَرِهَ أشدّ الکراهیة) رقی لێیە ڕق لێ بوونی زۆرو ،**

**بەمانای ( عاقب ) سزای دا..دێت ، ئەم سێ مانایە هەر سێکی بۆ ئەم شوێنە دەگونجێ ویەکتری تەواو دەکەن... کەواتە(ومانقموا منهم) یانی لە سەرەتاوە گاڵتەیان بە بڕوای بڕواداران کردو عەیبداریان کردن، ئنجا کە ئەمەیان سوودی نەبوو، ڕق وقینیان ئەستوورتر بوو بەرامبەریان، ئنجا سزایان دان بەسووتاندن... ئەمەش هەربەشێکە لە کورتبڕی(الایجاز) لە قورئاندا کە وشەیەك بەکاردەهێنێ فراوانەو چەند مانایەکی هەیەو هەمووشیان ڕاستن...**

**نمونەی دووەم**/(وَاللَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ، وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ) (التکویر:١٨)

**عسعس: یانی کاتێ شەودادێتو تاریکی دێت، هەروەها یانی کاتێك شەو کۆتایی دێت وتاریکی نامێنێت.... هەردوو ماناکەش دەگونجێ وقورئان سەرنج ڕادەکێشێ بۆ ئەو کاتەی کەشەو دادێت وەئەوکاتەش کە شەو کۆتایی دێت، واتە/ سوێند بێ بە شەو کە دادێت ( یان کۆتایی دێت ) و، بە بەرەبەیان**

کاتێك هەناسە دەدات ( هەروەك بەرەبەیان گیانی لەبەرابێت و زیندوو بێت وهەناسە بدات)...

**نموونەی سێیەم/** (أَفَمِنْ هَذَا الْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ، وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ، وَأَنْتُمْ سَامِدُونَ، فَاسْجُدُوا لِلَّهِ وَاعْبُدُوا) (لنجم:٦٢)

وشەی (سامدون )لە زمانی عەرەبی دا حەوت مانای هەیە:

١. لاهون لاعبون _ خەریکی گەمەو یارین وسەرقاڵن
٢. ساهون غافلون _ بێئاگان
٣. مشغولون بالغناء- سەرقاڵی گۆرانین
٤. متكبّرون بطرون أشرون- لوت بەرزن
٥. قائمون جامدون لاتتأثرون – هیچ کاریان تێناکات و وشکن وبێ شعورن
٦. أغبياء—بێ عەقڵن
٧. متحيرون - سەرگەردان و واقوڕماون

جا ئەم حەوت مانایە هەموویان دەگونجێن بەیەکەوە لەو شوێنەدا، چونکە ئەو سیفاتانە هەمووی لەو کافرانەدا هەن کە باسیان دەکات... مانای ئایەتەکەش( ئایا ئێوە لەم قسەیە کە قورئانە سەرسام دەبن ؟

پێدەکەنن و گریانتان نایەت بۆ ئەو چارەنوسە ڕەشەی کە چاوەڕێتانە، ئێوە بەردەوام سەرگەرمی ڕابواردن و گۆرانی ویارین وبێئاگان ولووت بەرزن وهیچ کارتان تێناکات وبێعەقڵ وسەرگەردانن ، دەی کەواتە بێداربنەوەو سوژدە بۆ خوای بەدیهێنەر ببەن وهەرئەویش بپەرستن ) .

**بنەمای نۆزدەیەم/ جوانکاری لە قورئاندا:**

جۆرێك لەجوانكاری دارشتنی قورئانی( الالتفات ) ە واتە/ گۆڕینی شێوازی قسە لە( خطاب )ەوە بۆ ( الغيبة ) و بۆ ( التكلم ) و.....هتد

أ- له (التكلم) بۆ( الخطاب) (وَمَا لِيَ لا أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ) (يّس:٢٢)

لەجياتى بفەرمویٚ (واليه أرجع) فەرمووی( وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ) ئەمەش گۆڕينه له وتاردا ، بڕوادارەکەی سورەتی یاسین له کاتێکدا ئامۆژگاری گەلەکەی دەکرد له باسی خۆیەوە هاتە سەر باسی ئەوان و وتی: بۆچی من ئەو خوایە نەپەرستم کە بەدی هێناوم، ئێوەش هەربۆلای ئەو دەبرێنەوە ( بۆ هەق وحساب ولێپرسینەوە) ..

ب- له( التكلم) بۆ (الغيبة)

(إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحاً مُبِيناً، لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطاً مُسْتَقِيماً) (الفتح:٢)

واتە/ ئەی پێغەمبەر(ص) بەڕاستی ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێبەخشیت ، (مەبەست ڕێکەوتنەکەی حودەيبيەیە)تا خوا لە هەموو گوناهانی ڕابردوو ئایندەشت خۆش ببێت . (ئەگەر شێوازی قسەکردنەکەی نەگۆڕیایە دەیفەرموو ( لِنغْفِرَ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ) کەچی گۆڕی ..

هەروەها ئايەتی (أَمْراً مِنْ عِنْدِنَا إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ، رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) (الدخان:٦)

( لەشەوی قەدردا هەموو کاروکردەوەو بەرنامەیەکی پڕ لە حیکمەت ودانایی لەیەك جیادەکرێنەوە)ئەمەش فەرمان وبڕیارێکە لەلایەن ئێمەوە، بێگومان ئێمە پێغەمبەرانیش دەنێرین و، ڕەوانەکردنی ئەم قورئانە ڕەحمەتی پەروەردگاری تۆیە بۆ بەرەی ئادەمی ، بەڕاستی هەر ئەویشە کە بیسەرو زانایە بە هەموو شتێك ...( دەکرا بفەرمووێ: انا كنا مرسلين، رحمة منا...)

ج_ له (خطاب) ەوە بۆ(الغيبة) :

(هُوَ الَّذِي يُسَيِّرُكُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ حَتَّى إِذَا كُنْتُمْ فِي الْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِمْ بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا بِهَا جَاءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَاءَهُمُ الْمَوْجُ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ أُحِيطَ

يهمْ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ لَئِنْ أَنْجَيْتَنَا مِنْ هَذِهِ لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ)
(يونس:٢٢)

**واته/ خوا ئەو زاتەیە کە لە وشکانی ودەریادا هاتوچۆتان پێدەکات، هەتا ئەو کاتەی کە لە کەشتیەکاندا دەبن و دەیانگوێزیتەوە بەهۆی باو شەماڵێکی ئارامەوەو هەموو پێی دڵخۆشن، ئینجا بایەکی توندو بەهێزو سەخت بەرەو کەشتی‌یەکە بێت وهەڵبکات ولەهەموو لایەکەوە شەپۆل بۆیان بێت، ئیتر وابزانن کە دەورە دراون و ڕزگاربوونیان ئەستەمە، ئا لەو کاتە دا خەڵکەکە لەناخەوە هانا وهاوار بۆ خوا دەبەن، دڵنیان کەخوا نەبێت کەس ناتوانێت فریایان بکەوێت، بە موخلیسی دوعا دەکەن ودەڵێن: بەخوا ئەگەر لەم بەڵایەو، لەم تەنگانەیە، ڕزگارمان بکەیت، ئەوە بەڕاستی دەچینە ڕیزی سوپاسگوزارانتەوە..**
(ئەکرا بفەرمویٚ: حَتَّى إِذَا كُنْتُمْ فِي الْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِكُم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ....)
**یان دەفەرمویٚ**( ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنْتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ ، يُطَافُ عَلَيْهِمْ بِصِحَافٍ مِنْ ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنْفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ وَأَنْتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ)
(الزخرف:٧١)

**واته/ پێیان دەفەرموێت فەرموون بچنە بەهەشتەوە خۆتان وهاوسەرەکانتان، خۆتان وئەوانەی وەك ئێوە خواناس بوون ولەوێ ژیانی کامەرانی وشادیتان پێدەدرێت . لەسەر سینی وکوپی ئاڵتون جۆرەها خواردن وخواردنەوەی جوان وڕازاوەو تام وبۆن خۆشیان بە سەردا دەگێڕن ولەو بەهەشتەدا هەرچی دڵ ونەفسیان حەزی پێبکات وچاویان پیٚی گەش بێتەوە تیایەتی وئێوەی خواناس تیایا ژیانی نەبڕاوەی تیا دەبەنەسەر....دەکرا بفەرمویٚ**(ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنْتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ يُطَافُ عَلَيْكُمْ....وَأَنْتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ)

......كه(يُطَافُ عَلَيْكُمْ...)ى كردووه به( يُطَافُ عَلَيْهِمْ) دوايش ديسان هاتۆتەوە سەر شێوەكەی پێشوو واته( خطاب)و دەفەرموێ ( وَأَنْتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ) ونافەرموێ (وهم فيها خالدون)...

ه- له(الغيبة)ه وه بۆ (التكلم)

(وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَاباً فَسُقْنَاهُ إِلَى بَلَدٍ مَيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا كَذَلِكَ النُّشُورُ) (فاطر:٩) واته/ خوا ئەو زاتەیە كە بای ڕەحمەت دەنێرێت وهەڵمی دەریاكانی پێدەگوێزێتەوەو دەیكاتە هەور، جائێمە دەینێرین بۆ وولاتێكی وشك ومردوو، ئنجا ئەو زەویەمان پێ زیندوو كردەوە دوای ئەوەی كە مرد بوو، زیندوو كردنەوەی ئێوەش هەر بەو شێوەیە دەبێت... لەپێشدا بە ( الغيبة ) دەست پێدەكات (الله الذى) وئینجا دەیكات( التكلم) ( فسقناه ، فأحييناه)......

هەروەها( سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ) (الاسراء:١)

واته/ پاكی وبێگەردی وستایش بۆ ئەو زاتەی كە شەو ڕەوی كرد لە بەشێكی كەمی شەودا بە بەندەی خۆی محمد(ص) لەمزگەوتی حەرام(كەعبە)ەوە بۆ مزگەوتی(الاقصى) لە(بيت المقدس) كە دەوروبەریمان پیرۆزو پڕبەرەكەت كردووە، تاهەندێك نیشانەو بەڵگەی دەسەلاتداری وتوانای خۆمانی پیشان بدەین، بەڕاستی ئەو زاتە بیسەرو بینایە...

لەپێشدا بە (الغيبة) ( سبحان الذى أسرى) دەست پێدەكات ئنجا دەچێتە سەر ( التكلم) (لنريه من أياتنا)

و/ له( الغيبة)ه وه بۆ( الخطاب)...(وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَاباً طَهُوراً ▪ إِنَّ هَذَا كَانَ لَكُمْ جَزَاءً وَكَانَ سَعْيُكُمْ مَشْكُوراً) (الانسان:٢٢)

واتـه/ لەلايـەن پەروەردگاريانـه شـەرابی پـاك وبێگـەردو خاوێنيـان پێشـكەش كراوه، بەڕاستی ئەمه پاداشتیئێوەيه...

لەپێشدا به(الغيبـة) دەسـت پیٚدەكـات(سـقاهم ربـهم)... دوايـی دەفـەرمویٚ به(الخطاب)( إِنَّ هَذَا كَانَ لَكُمْ جَزَاءً)نافەرمویٚ ( كَـانَ لَـهمْ جَزَاءً ).هـەروەها دەفەرمویٚ ( كان سعيكم ). يان/ (الحمدلله رب العـالمين) (الغيبـة) يەو دەبیٚ به(الخطاب)( اياك نعبدو اياك نستعين ، اهدنا ....)

**بنەمای بيستەم/ هەروەك بێگيانەكان زيندوو بن...**

شێوازێكی تايبەت لەقورئانداية، كه ئەويش باسكردنی بێگيانەكانه هـەروەك ئەوەی زيندووبن....

( فَوَجَدَا فِيهَا جِدَاراً يُرِيدُ أَنْ يَنْقَضَّ فَأَقَامَهُ) (الكهف:٧٧)واته:( موسى وخضر) ديوارێكيـان بـەدی كـرد دەيوويسـت بڕوخـێ( لـەكۆنی وپـەڕپوتیدا) ( خضر)لەخۆيەوه كەوته چاكردنەوەی ، تاچەند ساڵێكی تر بەرگه بگریٚ...

ب-( إِذَا رَأَتْهُمْ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَـهَا تَغَيُّظاً وَزَفِيراً) (الفرقـان:١٢) واته/ كاتێك لەدوورەوه ئاگری دۆزەخ كافران دەبينیٚ، دەنگی خەشم وقين وهەناسەی داخ لەدڵی دەبيستن... هەروەك ئەوەی دۆزەخ زيندوو بێت وببينێت وهەناسەی ببیٚ..

ج-( يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِـنْ مَزِيدٍ) (ق:٣٠) واته/ ڕۆژێك بەدۆزەخ دەڵێين: ئايا پڕبوويت؟ ئەويش لەوەلاٚمدا دەڵێت: ئايا كەسـی ترمـاوه، كەسی تر نی‌يه؟!( سەيری بەشیچوارەمی بەهاری دلاٚن بكه)....

**بنەمای بيست ويەك/ كۆتايی ئايەتەكان....**

وردبوونەوه لەكۆتايی ئايەتەكان پێويسته، چونكه بەحساب دانـراوەو مانـای تايبەت ومەبەستی بەرزو پيرۆزيان تيايه.... بۆ نموونه:

١. ڕۆژێك پیاوێكی عەرەبی دەشتەكی گوێی لەیەكێ‌بوو ئەم ئایەتەی خوێندەوە ( وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ) (المائدة:٣٨)

واتە/ دەستی پیاوی دزو ئافرەتی دز ببڕن لە پاداشتی كاری ناڕەوایاندا ئەمەش تۆڵەیەكە لەلایەن خواوە، خوا بالآدەست و دانایە...

بەڵام لە جیاتی (والله عزیز حكیم) وتی( غفور رحیم)، یەكسەر پیاوە دەشتەكی‌یەكە بۆی ڕاستكردەوەو بەفیترەت وسەلیقەی خۆی زانی كە هەڵەی كردووە، چونكە مەسەلەكە حوكمی كەسێكە دزی‌بكات وئەوەش لەخوای بالآدەستی بەحیكمەتەوە (عزیز حكیم )ەوە دەرچووەو باسی لێخۆشبوون لە ئارادا نیە ولێخۆش بوون ناگونجێ لەم سزادانەدا ..

لەمەسەلەی(حدود)و جێ بەجێ‌كردنی‌دا كاتێ ئیسپات دەبێت نەرم نیانی تیا نیەو نابێ بەزەیت پیابێتەوە، هەروەك لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت:( الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ) (النور:٢)

واتە/ سەد قامچی بدەن لەهەریەك لە ئافرەت وپیاوی زیناكەر، (ئەگەر محصن نەبن، واتە ئافرەتەكە شووی نەكردبێ وپیاوەكە ژنی نەهێنابێ ، بەڵام ئەگەر محصن بن واتە ئافرەتەكە شووی كردبێ‌و پیاوەكەش ژنی هێنابێ ئەوا ڕەجم دەكرێن تامردن )... بەزەیی نەتانگرێت لە بەجێهێنانی فەرمانی خوادا بۆیان ، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخواو بەڕۆژی دوایی هێناوە، بادەستەیەك لە بڕوادارانیش ئامادەی سزادانەكە بن...

٢. لە كۆتایی ئایەتەكاندا گرنگی دراوە بەماناو، تەنها هەر ئەوەنیە كە ئاسان وخۆش بێت لەسەر زمان و لەگەڵ كۆتایی ئایەتەكانی پێش خۆی ودوای خۆی دا بگونجێ...

بۆ نموونه: (ألف الاطـلاق) بەکارهاتووه لەوشەی( ظنونـا) و مانای خۆی هەیە، لەم ئایەتەدا کە ئەفەرمویٚ(وتظنون بالله الظنونا)الاحزاب/١٠

ئەگەر بیفەرموایە( وتظنون بالله الظنون) واتە/ لەشەڕی ئەحزابدا گومانتان بۆ دروست بوو، بەلاٚم کە دەفەرمویٚ، ( وتظنـون بـالله الظنونـا).واتـه/ لەشـەڕی ئەحزابدا گومانتان بۆ دروست بوو گومانێکی زۆر( لەبارەی سەرکەوتنەوە) .

هەروەها لە ئایـەتی( وأضل فرعون قومـه ومـا هـدی) طـه ٧٩/ ئەگـەر بیفەرموایە (وأضل فرعون قومه وما هداهم) ئەوە نەدەگونجا لەگـەڵ کۆتایی ئایەتـەکانی پێش تـرو دواتـردا، وەماناکەشـی دەبـوو بـە( فیرعـەون گەلەکـەی سەرگەردان کردو هیدایەتی نەدان ) دەی ڕەنگە هیدایەتی کەسانی تری دابیٚ غەیری گەلەکەی خۆی... بەلاٚم کاتیٚ دەفەرمویٚ( وما هدی ) لەگـەڵ کۆتـایی ئایەتەکانی پێشترو دواتـردا دەگونجیٚ و لەلایەکی تریشەوە ماناکەی دەبێـت بەوەی کە ( فیرعەون گەلەکەی سەرگەردان کردو هیدایـەتی کەسی نـەدا، هیچ کەسـیٚ ، نەگەلەکـەی ونەغـەیری گەلەکـەی ) کـە ئـەم مانایـەش خـوای گـەورە مەبەستێتی کە تێمان بگەیەنیٚ...

هەروەها وشەی( یتمطـی) هـەم لەگـەڵ ئایەتـەکانی تـردا دەگونجیٚ وهـەم حاڵـەتی ئـەو کەسـەمان بـۆ دەردەخـات کـە کەشـخە دەکـات وخـۆی بـادەدات، هەروەك دەفەرموێت( فَلا صَدَّقَ وَلا صَلَّى) (القیامە:٣١) (وَلَكِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّـى ، ثُمَّ ذَهَبَ إِلَـى أَهْلِـهِ يَتَمَطَّـى ، أَوْلَـى لَـكَ فَـأَوْلَى ، ثُـمَّ أَوْلَـى لَـكَ فَـأَوْلَى) (القیامـە:٣٥)واتـە/بەڵکو بڕوای نەهێناو پشتی تێکرد، پاشان هەموو جار بە لەنجەو لارو خۆبادانەوە دەگەڕایەوە بۆ ناو کەس وکاری وکەشخەی دەکرد، جا ( ئەم دۆزەخە) بۆ تۆ شیاوترو لەبارترە، پاشان هەر ئەو سزایە بۆ تۆ شیاوترو لەبارترە....

**بنەمای بیست ودوو/ بەراوركردنی سوورەتەكان...**

وتمان هەر سوورەتێك كەسایەتیەكی تایبەتی خۆی هەیە وهەر وشەیەكی تیا بەكار هاتبێ، ڕەچاوی كەسایەتی سوورەتەكە كراوە، جا لەبەراورد كردن لەنێوان سوورەتەكاندا، چاكتر لەمەبەستی بەكارهێنانی وشەیەك یان ئایەتێك تێدەگەین...بۆ نموونە :

**یەكەم/** لەسوورەتی ( صافات ) دا وشەی( يُنزَفون) كە( مبنی للمجهول)ە بەكار هاتووە لە ئایەتی(لا فِيهَا غَوْلٌ وَلا هُمْ عَنْهَا يُنْزَفُونَ) (الصافات:٤٧) ( يُنْزَفون) لە( نُزِفَ)ەوە وەرگیراوە، كە(مبنی للمجهول)ەو یانی (سەرخۆش بوون وئاگا لەخۆنەمان )..... واتە: ئەو شەرابەی بەهەشت نابێتە مایەی سەرخۆشی وبێهۆشی.. بەلاّم لەسوورەتی (الواقعە)/١٩دا،دەفەرموێت(لا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلا يُنْزِفُونَ) (الواقعة:١٩) ( يُنزِفون) لە( أنـزَفَ، يُنْزِفُ)ەوەهاتووە ، واتە ( شەرابەكەی تەواو بوو، وە سەرخۆش وبێ هۆش بوو) واتەی ئایەتەكەش(شەرابی بەهەشت تەواو نابێت وكەس سەرخۆش وبێهۆش ناكات)...لە (واقعە)دا وشەیەك بەكارهاتووە كەمانای زیاتر دەبەخشێ و، ئەمەش پەیوەندی بەسورەتی(الواقعە)ەوە هەیە، كەزیاتر شتی تیا بەكارهاتووە لە سوورەتی(الصافات)..

| الصافات | الواقعە(نیعمەتەكانی زیاترە) |
|---|---|
| ١- أُولَئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَعْلُومٌ فَوَاكِهُ<br>**لێرەدا باسی ڕزق كراوە كەمیوەیە** | * وَفَاكِهَةٍ مِمَّا يَتَخَيَّرُونَ ، وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ،<br>**( لێرەدا میوەو گۆشتی باڵندە باسكراوە میوەكەش هەڵدەبژێرن وگۆشتەكەش كامەی حەزی** |

| | |
|---|---|
| | لیٚدەکەن). |
| ٢- وَهُمْ مُكْرَمُونَ ، فی جنات النعیم<br>واتە/ قەدرو ڕیٚزیان هەیە | * أُولَئِكَ الْمُقَرَّبُونَ فی جنات النعیم<br>لیٚرەدا ئەوانە نزیك کراوەی بارەگای خوان کە ڕیٚزی زیاتری تیایە |
| ٣-(عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ) واتە/ لەسەرکورسی وجێگای ڕازاوە بەرامبەر بەیەك دادەنیشن | *عَلَى سُرُرٍ مَوْضُونَةٍ<br>لەسەر کورسی وجێگای چنراو بەئاڵتون دادەنیشن |
| ٤- يُطَافُ عَلَيْهِمْ (مبنی للمجهول)ە بۆیان دەگێڕڕێت شەراب، ئیتر کێ دەیگێڕێ وچۆن نازانین... | *يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ<br>لیٚرەدا/ لاوانی جوان وئێسك سووك ونەمر بەدەوریاندا دێن وخزمەتیان دەکەن... ئەمەش زیادە نیعمەتە کەباسی خزمەتکارەکانیش دەکات |
| ٥- بِكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ<br>لەپەرداخی تایبەتدا بۆیان دەگێڕڕێت | *بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ<br>لیٚرەشدا/ بەکوپ ودۆلکە وسوراحیەوە دەگەڕێن ولەپەرداخی تایبەتدا جۆرەها شەرابی خۆشیان دەدەنێ... خزمەتەکە زیاترەوجۆری گێران وپەرداخ زیاترن... |
| ٦-لا فِيهَا غَوْلٌ وَلا هُمْ عَنْهَا يُنْزَفُونَ<br>ئەو شەرابە نابێتە هۆی بێهۆشی وسەرخۆش بوون.( ئیتر نالێت سەریان دێشێت یان نا!) | *لا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلا يُنْزِفُونَ<br>ئەو شەرابە نەسەریان دەیەشێنێ ونەتەواویش دەبێت ( ئەم تەواو نەبوونە کە باس دەکات زیادە ڕیٚزو حورمەت و خزمەتە)جا کە نەفی |

| | |
|---|---|
| | سەریەشە دەکات، کەواتە ئەوانی تریش نابن وەك سەرخۆشی وبێهۆشی .. |
| ٧-وَعِنْدَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ عِينٌ، كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَكْنُونٌ<br>حۆری چاوگەش لەلایانن، کەجگە لە هاوسەرەکانیان چاو بۆ کەسی تر هەڵنابڕن وهەر دەڵێی هێلکەی پاکراوو شاراوەن(کەس دەستی بەریان نەکەوتووە) | * وَحُورٌ عِينٌ ، كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ<br>لێرەشدا/ حۆری چاوگەش لەلایانە کە هەر دەڵێی مرواری شاراوەو دەست بەرنەکەوتوون |
| ٨.......................... | * جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ<br>باسی جەزاو پاداشتیان دەکات،.. وەك بفەرموێ هەقی خۆیانەو پاداشتی کارەکانیانە |
| ٩-..................... | * لا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْواً وَلا تَأْثِيماً،إِلَّا قِيلاً سَلاماً سَلاماً) واتە/ هیچ جۆرە قسەیەکی نابەجێ ونادروست وناپێك نابیستن، مەگەر وتنی سڵاوو وەڵامدانەوەی... |

کەواتە/ (وَلا يُنْزِفُونَ) کەمانای بێهۆش نەبوونەو مانایەکی زیاتریشی تیایە کە تەواو نابێت ، پڕبە پێستی سوورەتی (الواقعە) یەو هەقی خۆیەتی لەویابێت،

**چونکە هەموو نیعمەتەکان کەباس دەکات زیاترن لەوەی کە لە صافات دا باسکراون.........**( بلاغة الكلمة فی القرآن) د. فاضل السامرائی.

**دووەم/لە سوورەتی** (الشعراء) **دا هەرچەندە باسی هارون هاتووە لەگەڵ حەزرەتی موسادا سەلامی خوایان لێبێت ، بەڵام دارشتنی ئایەتەکان زیاتر بە تاک** (مفرد) **هاتووە ، واتە حەزرەتی موسا دەردەخات وقسە دەکات... بۆیە دەبینین دەفەرموێت** ( فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولا إِنَّا رَسُولُ رَبِّ الْعَالَمِينَ) (الشعراء:١٦)/**لێرەدا**(فقولا)(رسولُ) **بەڵام لە سوورەتی**( طه) **دا دەفەرموێت** (فَأْتِيَاهُ فَقُولا إِنَّا رَسُولا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرائيلَ (طه:٤٧) **لێرەدا** (فقولا) (رسولا)... **هەردووکیان** ( مثنى) ن ....

**ئەمەش چونکە سوورەتی**(طه) **زیاتر بە**(مثنى) **هاتووە بۆیە ئەمیش وا بە** ( مثنى) **هاتووە...**

| الشعراء(١٠- ٤٥) | طه (٤٢-٦٣) |
| --- | --- |
| (وَإِذْ نَادَى رَبُّكَ مُوسَى أَنِ ائْتِ الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ..... قَالَ كَلَّا فَاذْهَبَا بِآيَاتِنَا إِنَّا مَعَكُمْ مُسْتَمِعُونَ.. فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولا إِنَّا رَسُولُ رَبِّ الْعَالَمِينَ،أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرائيلَ ...... قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيداً ............ | اذْهَبْ أَنْتَ وَأَخُوكَ بِآيَاتِي وَلا تَنِيَا فِي ذِكْرِي,اذْهَبَا إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى ، فَقُولا لَهُ قَوْلاً لَيِّناً لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى, قَالا رَبَّنَا إِنَّنَا نَخَافُ أَنْ يَفْرُطَ عَلَيْنَا أَوْ أَنْ يَطْغَى، قَالَ لا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى ، فَأْتِيَاهُ فَقُولا إِنَّا رَسُولا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرائيلَ وَلا تُعَذِّبْهُمْ قَدْ جِئْنَاكَ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكَ وَالسَّلامُ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى ، |

| إنَّا قَدْ أُوحِيَ إِلَيْنَا أَنَّ الْعَذَابَ عَلَى مَنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى ، قَالَ فَمَنْ رَبُّكُمَا يَا مُوسَى، قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى ، قَالُوا إِنْ هَذَانِ لَسَاحِرَانِ يُرِيدَانِ أَنْ يُخْرِجَاكُمْ مِنْ أَرْضِكُمْ بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ الْمُثْلَى) (طـه:٦٣) | وفعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ قَال فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ الْعَالَمِينَ ........... يريد أَنْ يُخْرِجَكُمْ مِنْ أَرْضِكُمْ بِسِحْرِهِ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ.. قَالَ لَهُمْ مُوسَى أَلْقُوا مَا أَنْتُمْ مُلْقُونَ......... فَأَلْقَى مُوسَى عَصَاه |
|---|---|

- **لە سوورەتی (الزخرف) یشدا لەبەر ئەوەی باسی هارون نەهاتووە، هەمووی بە تاك هاتووە و دەفەرموێ**(وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآيَاتِنَا إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَإِهِ فَقَالَ إِنِّي رَسُولُ رَبِّ الْعَالَمِينَ )الزخرف٤٦/(فقال) و(رسول) **هەردووكی تاكە، كەواتە قورئان لە ئایەتەكانی داو لەبەكارهێنانی ووشەداو لەتاك وجووت وكۆدا حسابی سوورەتەكەو ئایەتەكانی دەوروبەری دەكات تا ئەوشتەی بەكاری دەهێنێ تەواوترین وچاكترین بەكارهێنان بێت.**(بلاغة الكلمة فی القرآن) د.فاضل السامرائی

## سێیەم /جیاوازی نێوان چیرۆكی حەزرەتی ئیبراهیم لە سێ سوورەتدا:

**چیرۆكی حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێت لەچەند جێگایەكدا هاتووە، لەهەر جێگایەكدا تابلۆیەكی هونەری یەو بە ووشەی جوان نەخشێنراوەو ئامانجی پەروەردەیی خۆی پێكاوەو، ئەگەر بەراوردیان بكەین دەبینین:**

**لەسوورەتی**( الذاريات )**دا باسی میوانە بەڕێزەكانی حەزرەتی ئیبراهیم دەكات بۆیە هەموو ئایەتەكان لەگەڵ وشەی (مكرمین) دا دەگونجێ و كەش**

وهەواکە ڕێزداری تیا دەخوێنرێتەوە، کەچی لە سوورەتی(الحجر) دا وانیەو ترس زیاتر دەردەکەوێت وزاڵە لەو میوانە نەناسراوانە وباسی غەفورو ڕەحیمی خواو سزای خوای تیا دەردەخات....

| الذاريات ٢٤-٣٢ | الحجر٤٩-٥٨ |
|---|---|
| هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ ..<br>واتە/ ئایا هەواڵی میوانە بەڕێزەکانی ئیبراهیمت پێگەیشتووە؟<br>(إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلاماً قَالَ سَلامٌ قَوْمٌ مُنْكَرُونَ)<br>واتە/ کاتێك چوون بۆ سەردانی و وتیان: سڵاو ..<br>ئەویش وتی: سڵاو( کۆمەڵێکی نەناسراو)ئەوان بەڕستەیەکی فیعلی سەلامیان لێکردو ئەو بەچاکتر وەلامی دانەوە بەڕستەیەکی(اسمی) کە(ثبوت)و بەهێزترە لەوەی ئەوان...<br>( فَرَاغَ إِلَى أَهْلِهِ فَجَاءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ، فَقَرَّبَهُ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلا تَأْكُلُونَ، فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لا تَخَفْ وَبَشَّرُوهُ | لێرەدا چیرۆکەکە دوای ئایەتی(نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ، وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ الْعَذَابُ الأَلِيمُ)<br>بەحەزرەت ڕادەگەیەنێ هەواڵ بدات به بەندەکانی خوا کە خوا غەفورو ڕەحیم وسزاکەشی سزایەکی بەسوێیە، ئنجا چیرۆکیئیبراهیمیش وەك بەڵگەیەك ونموونەیەك لەسەر ئەو مەسەلەیە دەست پێدەکات بەهەمان وشەی(نبیء) ....<br>( وَنَبِّئْهُمْ عَنْ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ) .<br>واتە هەواڵیان بدەرێ دەربارەی میوانەکانی ئیبراهیم<br>(إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلاماً قَالَ إِنَّا مِنْكُمْ وَجِلُونَ ، قَالُوا لا توجلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلامٍ عَلِيمٍ) واتە/ کاتێك خۆیان کرد بەماڵداو وتیان سڵاو،<br>وتی: بەڕاستی ئێمە لێتان دەترسین (لێرەدا ترسەکە دەخاتە ڕوو)بۆیە |

بِغُلَامٍ عَلِيمٍ)
واتە/ ئەوساخۆی دزیەوەو، چوو بەهاوکاری خێزانی ، گوێرەکەیەکی قەڵەوی سەربڕی وسوریانکردەوەوهێنای، لێی نزیک کردنەوە، فەرمووی لێکردن، کە بینی ناخۆن، فەرمووی ئەوە بۆ نافەرموون،ئەوە ناخۆن؟! ئیبراهیم ترسێکی لێنیشت(چونکە زانی شتێکیان لەژێر سەردایە واناخۆن)، بۆیە خێرا وتیان: مەترسە ئێمە فریشتەین، مژدەشیان پێدا کە خوا بەم نزیکانە منداڵێکی زانایان پێدەبەخشێت)
لێرەدا فەرمووی ( فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ) لەگەڵیا فەرمووی( وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ) (بە رستەی فیعلی)وتی وبە(فیعلی) وەڵامیان دایەوە، هەروەها لێرەدا هەروەك خۆی بەتەنها ترسابێت(کەمتر ترسەکە دەردەخات)
لێرەدا ڕووبەڕوویان نەیفەرموو دەترسین لێتان بەڵکو دەفەرمویٚ(ئێمە لێتان دەترسین)
وتیان:مەترسە ئێمە بێگومان مژدەی لەدایك بوونی کوڕێکی زانات ئەدەینیٚ
*قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَى أَنْ مَسَّنِيَ الْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ۔ قَالُوا بَشَّرْنَاكَ بِالْحَقِّ فَلَا تَكُنْ مِنَ الْقَانِطِينَ قَالَ وَمَنْ يَقْنَطُ مِنْ رَحْمَةِ رَبِّهِ إِلَّا الضَّالُّونَ)
ئیبراهیم فەرمووی: ئایا مژدەم دەدەنیٚ لەکاتێکدا کە ئاوا پیری یەخەی پێگرتووم ! جا چۆن وبەچی مژدەدەدەن؟!
( چونکە دەترسیٚ موجادەلە دەکات وەك گومانی هەبیٚ لەقسەکانیان )
وتیان: بەڕاستیمژدەت دەدەینیٚ ، کەواتە نەکەیت لەو کەسانەبیت کە نائومێدن لەبەخششەکانی خوا ..
فەرمووی : ئایا کیٚ نائومێد دەبیٚ لەڕەحمەت وبەخششەکانی پەروەردگاری، مەگەر کەسانێك کە گومڕاوسەرگەردانن...لێرەدا فەرمووی (انا منکم وجلون) لەگەڵیا فەرمووی ( (انا نبشرك بغلام علیم) بەڕستەی (اسمی)وتیو بە (اسمی )وەڵامیان

| | |
|---|---|
| بەشـێوەی(الغیبـــە)فـــەرمووی بەبێ(تأکید کردن).. بۆیە :<br>(*فَأَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ, قَالُوا كَذَلِكِ قَالَ رَبُّكِ إِنَّهُ هُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ)<br>خـێزانی ئیبراهیم دەنگی لێبەرزبووەوەو دای بەڕوومەتی خۆیداو بەسەرسامی‌یەوە وتی: پیرەژنێکی نەزۆك، چۆن منداڵی دەبێت؟! فریشتەکان وتیان: ئەوە فەرمانی پەروەردگارتەو ئەو زاتێکی داناو زانایە.<br>*( قال فماخطبکم أیها المرسلون، قالوا إنا أرسلنا الی قوم مجرمین)<br>ئیبراهیم فەرمووی: باشە چ کارێکی گرنگتان بەدەستەوەیە؟!<br>فریشتەکان ووتیان: بەڕاستی ئێمە ڕەوانەکراوین بۆ گەلێکی تاوانبار ( کە گەلی لوط)ە | دایەوە ..<br>لێرەدا دەفەرموێ(انا منکم وجلون) ئێمە هەردووکمان (خۆم وهاوسەرەکەم) زۆر دەترسین لێتان... هەروەها( وَجِلُونَ) سیفەی (المشبهە) یەو مانای (ترسی زۆرە)<br>لێرەدا چونکە باسی ترسی خۆی خێزانەکەی دەرخست ، باسی هاتنی خێزانی وسەرسوڕمانەکەی ناکات ودێتە سەر باسی پرسیاری ئیبراهیم لێیان کە بۆچ کارێکی گرنگ هاتوون، ئەوانیش دەڵێن: ئێمە بەڕاستی نێردراوین بۆسەرگەلێکی تاوانبار( قال فما خطبکم أیها المرسلون، قالوا انا أرسلنا الی قوم مجرمین) |

## چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم لەسوورەتی(هود)دا:

**تـەوەرەی سـورەتی(هـود) باسـی مـژدەدان وئینزارکردنـە وهـەروەها پاداشـتی ئەوانەی کە باوەڕدێنن ودەرچوونی فەرمانی خواش (أمر ربك) بۆ ئەوانەی کە یاخین ولە ناوبردنیـان.. چیرۆکـەکانیش کـە لـەم سـوورەتەدا هـاتوون جـەخت دەکەنە سەر ئەو تەوەرەیە..**

**ئەوەتە سورەتەکە لە سەرەتاوە ئاوا دەست پیێدەکات** ( الر كِتَابٌ أُحكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِنْ لَدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ،الا تعبدوا الا الله ، انني لكم منـه نذيـر وبشـير ، وَأَنِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُمْ مَتَاعاً حَسَناً إِلَى أَجَلٍ مُسَمّىً وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٍ فَضْلَهُ وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ، إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) (هود:٤)

**ئنجا لەئایەتەکانی دواتردا دەفەرموێ کافران لەدەستمان دەرناچن** (أُولَئِكَ لَمْ يَكُونُوا مُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ ) (هود:٢٠) **پاشان دێتە سەر چیرۆکی پێغەمبەران و لـە هـەموویاندا هاتنی فەرمانی خوا بە سزادانیان دەخاتـە ڕوو ، تـا کـافران پەندی لێوەرگرن ودەفەرموێت:**

**أ- لەچیرۆکی نوح دا**( حَتَّى إِذَا جَاءَ أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ قُلْنَا احْمِلْ فِيهَا مِنْ كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَنْ سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ وَمَنْ آمَنَ وَمَا آمَنَ مَعَـهُ إِلَّـا قَلِيـلٌ) (هود:٤٠)

**کاتێك شەپۆلە گەورەکان شالاّویان دەهێنـا بـە فـەرمانی خـوا ، (نـوح) بـانگی کوڕەکەی کرد کە ئیمان بێنێ وبێتە ناو کەشتییەکەوە ولەگەلّ کافراندا نەبێت ، کوڕی سەرسەخت وتی : ئەچمە سەر چیایەك دەمپارێزێ لەئاوو لافاو، (نوح) فەرمووی: مەسەلە ئاوو لافاو نییە، مەسەلە غەزەبی خوایە، فەرمانی خوایە بە لە ناوچوونی کافران وکەسیش قوتار نابێت ( ئالێرەش ئەمری خـوا جـەخت کرایەوە سەری ) :**

( وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ وَنَادَى نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِـي مَعْزِلٍ يَـا بُنَـيَّ ارْكَبْ مَعَنَا وَلا تَكُنْ مَعَ الْكَافِرِينَ ، قَالَ سَآوِي إِلَى جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاءِ قَالَ

لا عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِلَّا مَنْ رَحِمَ وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ) (هود:٤٣)

پاشان دەفەرمویٚ(وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ) (هود:٤٤)

**واتە/ پاشان فەرماندرا بەزەوی: ئاوەکەت بارۆبچێت بە ناختدا، ئەی ئاسمان تۆش بابەس بێت وباران مەبارێنە، ئیتر ئاوەکە ڕۆچوو، فەرمانیش بەڕێکی وتەواوی ئەنجامدرا، کەشتییەکەش لەسەر کێوی جودی وەستاو لەنگەری گرتو، وترا: دەك دووری لە بەزەیی خواو تیاچوون بۆ بەرەی ستەمکاران..**

**ب- لەچیرۆکی(عاد)یش دا، بەهەمان شێوە بڕوایان نەهێناو بەفەرمانی خوا تیاچوون وبڕوادارانیش ڕزگاریان بوو(** وَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُوداً وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِنَّا وَنَجَّيْنَاهُمْ مِنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ) (هود:٥٨)

**ج- گەلی(هود)یش بەهەمان شێوە** ( فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَالِحاً وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِنَّا وَمِنْ خِزْيِ يَوْمِئِذٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ) (هود:٦٦)

**د-ئینجا چیرۆکی ئیبراهیم دێت سەلامی خوای لێبێت کە لە سەرەتاوە باسی ( مژدەدانەکە دەکات، کە مژدەی منداڵەکەی ئەدەنێ ) ئنجا ئایەتەکان بەو پێیە دێن و وەکو سورەتی( ذاریات)ە کەمژدەو خۆشی زیاتر زاڵە بەسەریدا نەك ترس وەك سورەتی (الحجر) ئەوەتا دەفەرموێت:**

*(وَلَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى قَالُوا سَلاماً قَالَ سَلامٌ فَمَا لَبِثَ أَنْ جَاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ، فَلَمَّا رَأَى أَيْدِيَهُمْ لا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لا تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمِ لُوطٍ) (هود:٧٠)

**واتە/ سوێندبێ، بێگومان وەفدێکی ڕەوانەکراوی ئێمە لە فریشتە هاتنە لای ئیبراهیم بەمژدەوە (مژدەی بوونی منداڵێك)و وتیان: سڵاوی خوات لێبێت، ئەمیش فەرمووی: سڵاوی خوا لە ئێوەش، دوای بەخێرهاتنیان ڕۆیشت وجا زۆری پێنەچوو گەڕایەوە بەگۆشتی گوێرەکەیەکی برژاوەوە، جا کاتێك بینی**

دەستی بۆ نابەن، کارەکەیانی بە نائاسایی داناو لە دڵی خۆیدا لێیان ترسا، ئەوانیش هەستیان پێکردو وتیان: مەترسە ، بەڕاستی ئێمە نێرراوین بۆ لای گەلی ( لوط )...

( وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِنْ وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ, قَالَتْ يَا وَيْلَتَى أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ وَهَذَا بَعْلِي شَيْخاً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ, قَالُوا أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ رَحْمَتُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ إِنَّهُ حَمِيدٌ مَجِيدٌ) (هود:٧٣)

واتە/ لەو کاتەدا خێزانەکەی وەستابوو ، یەکسەر پێکەنی ، مژدەمان دایە کە ئیسحاقت پیٚدەبەخشین لەدوایئەویش یەعقوب( کە لە نەوەی ئیسحاق دێتە دنیاوە) (سارە) خاتوون وتی: وەی ڕۆ، شەرمەزار خۆم، چۆن منداڵم دەبێت من پیرم وئەمەش مێردەکەمە ، پیرو بەساڵاچووە، بەڕاستی ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە ! فریشتەکان وتیان: ئایا سەرسام دەبیت لە (ئەمریخوا) ؟! ڕەحمەت وبەرەکەتی خواتان لەسەربێت ئەی خێزانی ئەم ماڵە پیرۆزە، (بێگومان خوا کاری وادەکات)و هەمیشە ئەو زاتە سوپاسکراوەو خاوەنی بەرزی ودەسەلاٌتیشە...ئنجا لەسەر چیرۆکەکە بەردەوام دەبێت ودەفەرموێت ( فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ الرَّوْعُ وَجَاءَتْهُ الْبُشْرَى يُجَادِلُنَا فِي قَوْمِ لُوطٍ ، إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّاهٌ مُنِيبٌ ، يَا إِبْرَاهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا إِنَّهُ قَدْ جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَإِنَّهُمْ آتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ) (هود:٧٦)

واتە/ کاتێك ترسەکە لە دڵی ئیبراهیم دەرچوو(هێمن بووەوە) ومژدەکەشی بۆهاتبوو، ئینجا دەستی کرد بە باسکردن وموجادەلە دەربارەی گەلی ( لوط)... بەڕاستی ئیبراهیم زۆر لەسەر خۆو بەئارام وخەم خۆرو گەڕاوەیە بۆلای خوا، فریشتەکان وتیان:ئەی ئیبراهیم وازبهێنە لەو باسە، دڵنیابە، بەڕاستی پەروەردگارت فەرمانی داوەو کار تەواو بووەو بێگومان سزایەکیان بۆ هاتووە کەناگەڕێتەوە....

ف- ئینجا باسی چیرۆکی گەلی ( لوط)دەکات ودەفەرموێت ( فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِنْ سِجِّيلٍ مَنْضُودٍ، مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ) (هود:٨٣)

واتە/ کاتێك فەرمانی ئێمە بۆ تیاچوونیان هات شارۆچکەکەیانمان ژێرەو ژوور کردو بەقوڕی سورەوەکراوی وەك بەرد، چین لەسەر چین بەردبارانمان کردن... هەموو ئەوبەردانە دیاری کرابوون، لەلایەن پەروەردگارتەوە، کەبدات بەتەوقی سەری کێدا، ئەم کارەسات وبەردبارانەش وەنەبێت دووربێت لە ستەمکارانەوە ( ئەمەش پەندە کەلێی وەربگیرێ ) ..

م- گەلی(مدین)یش حەزرەتی( صالح)یان بۆ نێردراو بەهەمان شێوە فەرمانی خوا دەرچوو بۆ تیا چوونی کافران ( وَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْباً وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِنَّا وَأَخَذَتِ الَّذِينَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ ، كَأَنْ لَمْ يَغْنَوْا فِيهَا ألا بُعْداً لِمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ) (هود:٩٥)

کاتێکیش فەرمانی ئێمە هات بۆ تیاچوونیان، شوعەیب وئەوانەی بڕوایان هێنا بوو لەگەڵیدا بەهۆی بەزەیی ولوتفی خۆمان، رزگارمان کردن و نرکەو ناڵەی تیاچوون تاوانکارو بێبڕواکانی گرتەوەو جا هەموویان لەشوێن وجێگەی خۆیان تیاچوون وبەچۆکدا هاتن لە بەرەبەیاندا، هەروەك لەوێ نەژیابن، ئاگاداربن ، دەك(مدین) لەوەو لاتر بچێت هەروەك (ثمود) لەوەو لاتر چوو...

ن- گەلی فیرعەونیش لەجیاتی دوای فەرمانی خوا بکەون، دوای فەرمانی فیرعەون کەوتن، کەفەرمانی نابەجێ وناتەواو بوو( وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَإِهِ فَاتَّبَعُوا أَمْرَ فِرْعَوْنَ وَمَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ) (هود:٩٧)

و- ئەم دەنگ وباسە کە بۆت باس دەکەین ، ئێمە ستەممان لێ نەکردوون، کاتێ بەفەرمانی خوا تیاچوون ( ذَلِكَ مِنْ أَنْبَاءِ الْقُرَى نَقُصُّهُ عَلَيْكَ مِنْهَا قَائِمٌ وَحَصِيدٌ،

وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِنْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ آلِهَتُهُمُ الَّتِي يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ لَمَّا جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ، وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ،إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِمَنْ خَافَ عَذَابَ الْآخِرَةِ ذَلِكَ يَوْمٌ مَجْمُوعٌ لَهُ النَّاسُ وَذَلِكَ يَوْمٌ مَشْهُودٌ، وَمَا نُؤَخِّرُهُ إِلَّا لِأَجَلٍ مَعْدُودٍ) (هود:١٠٤)

**واته/ ئەوەی کە باسکرا هەندێك بوو لە هەواڵی خەڵکی ئەوشارو شارۆچکانە، بۆت دەگێڕینەوە، هەندێك لەو شارو دێهاتانە ماون وهەندێکی تری بە تەواوی وێران بوون، ئێمە ستەممان لێنەکردن، بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد، ئەوسا ئەوپەرستراوانەیان کە لەجیاتی خوا هاواریان لێدەکردن، فریای هیچ شتێکیان نەکەوتن کاتێك فەرمانی پەروەردگاری تۆ هات ، هیچیان بۆ زیاد نەکردن جگە لەتیاچوون نەبێت،،،، ئا بەو شێوەیەش تۆڵە سەندنی پەروەردگاری تۆ، کاتێك تۆڵە دەسێنێت لە خەڵکی شارو دێهاتەکان لەحاڵێکدا کە ستەم پیشەیان بوو، بەڕاستی تۆڵە سەندنەکەی زۆر بەئێش وبەهێزو توندە... بێگومان لەو بەسەرهاتەدا نیشانەو پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆکەسێك لە سزای ڕۆژی دوایی بترسێت، ئەوە ڕۆژێکە خەڵکی بۆی کۆدەکرێنەوەو ئەوە ڕۆژێکە خەڵکی هەموو ئامادەکراون وهەمووان لەبەرچاون تیایدا، ئێمە هاتنی ئەو ڕۆژە دواناخەین مەگەر بۆ کاتێکی کەم وسنووردار نەبێت...**

**ی- ئینجا بەحەزرەت(ص) دەفەرموێت کە ئیستقامەی هەبێت بەوشێوەی کە خوا ئەمری پێکردووە، خۆی وئەوانەی کە تەوبەیان کردووە لە گەڵیداو لە سنوور لانەدەن چونکە ئاگاداری کارەکانیانە**(فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَنْ تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ) (هود:١١٢)

**ئنجا پاش ئەم گەشتە ئیمانی‌یە کە(١٢٣) ئایەتەو سورەتی هودیان پێك هێناوە، بە باسی ئەوەی کە هەرکەس لابدات، بەفەرمانی خوا تیادەچێت وچاکانیش بەفەرمانی خوا خۆش بەختی دنیاو قیمەتن ، هەموو ئەمرو فەرمانێکیش بۆ**

خوا دەگەڕێتەوە نەك بۆ فیرعەون وتاغوتەكان، بۆیە دەبێت تەنها ئەو بپەرستریٚ وتەنها پشتیش بەو ببەسترێت...( چیرۆكەكانیش هەمووی لەخزمەتی ئەم باسەدا بوون وهەریەكەیان بەحیكمەت لەو شوێنەدا دانراون وشتانێك لەو چیرۆكانە باسكراون كە پێویست بن لەم سورەتەداو لەگەلٚ دەوروبەریدا بگونجێن، ئەوەتا باسی ( أتعجبين من أمر الله) ئالێرەدا هاتووە لەچیرۆكی حەزرەتی ئیبراهیمدا، كە لە سورەتەكانی تردا لە باسی ئیبراهیم دا نەهاتووە، چونكە پەروەردگار مەبەستێتی كە جەخت بكاتە سەر تێگەیشتن لە(ئەمری خوا)..... ئەمەش دوائایەتەكانی سوورەتەكەیە:

( وَكُلاًّ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنْبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءَكَ فِي هَذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ ، وَقُلْ لِلَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَامِلُونَ ، وَانْتَظِرُوا إِنَّا مُنْتَظِرُونَ ، وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الْأَمْرُ كُلُّهُ فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ) (هود:١٢٣)

## بازرگانییەكی پڕخێر

قورئان فەرموودەی خوایە ، بەرنامەی بەرەی ئادەمی‌یە تا ئەو ڕۆژەی كەخۆر لە خۆرئاواوە هەلٚدێت و، دنیاو ئاخیرەتی هەموو كەس وەستاوەتە سەر پەیڕەوی ئەو پەڕاوە... بەسە بۆ گەورەیی قورئان كە خوا شایەتی بۆ دەدات ودەفەرموێت:

( رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزاً حَكِيماً، لَكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنْزَلَ إِلَيْكَ أَنْزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلائِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيداً ، الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ قَدْ ضَلُّوا ضَلالاً بَعِيداً) (النساء:١٦٧)

واتە/ پێغەمبەرانمان ڕەوانە كردووە كە مژدەدەرن وترسێنەرن ، تاخەلٚكی هیچ بەلٚگەیەكیان بەدەستەوە نەمێنێت و (بیانوویان نەمێنێت) لەسەربیٚ دینی

وياخی بوون، دوای ئەوەی خوا پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە كردوون، بێگومان هەمیشەو بەردەوام خوا بالأدەستی دانایە ..

خوێندنی قورئان وپەیڕەوی كردنی بازرگانییەكە هەمیشە قازانج دەكات ومایەی خێرو بەرەكەتی نەبڕاوەیە ، قورئان دەفەرموێت :

(إِنَّ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَأَقَامُوا الصَّلاةَ وَأَنْفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرّاً وَعَلانِيَةً يَرْجُونَ تِجَارَةً لَنْ تَبُورَ، لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُمْ مِنْ فَضْلِهِ إِنَّهُ غَفُورٌ شَكُورٌ) (فاطر:٣٠) واتە/ بەڕاستی ئەوانەی كە پەیامی خوا دەخوێننەوەو نوێژەكانیان بەچاكی ئەنجام داوەو لەو ڕزق وڕۆزی وسامانەی پێمان بەخشیوون، بەخشیویانە بەنهێنی وبە ئاشكرا، ئەوانە بە ئومێدی بازرگانییەك ئەو كارە دەكەن كە هەرگیز نائومێدو زەرەرمەند نابن، بۆ ئەوەی خوای میهرەبانیش بەڵێنی خۆی بباتە سەر، بەبەخشینی پاداشت بۆیان و، لەخەڵات وبەخششی زیاتریش بەهرەمەندیان بكات، بەڕاستی ئەو خوایە لێخۆشبووی سوپاسگوزارە... حەزرەتیش(ص) لەفەرموودەیەكدا باسی فەزڵ وگەورەیی قورئانمان بۆ دەكات و دەفەرموێت :

﴿ تعلموا سورة البقرة ، فإنَّ أخْذَها بَرَكَةٌ وتركها حسرة ولا يستطيعها البَطَلَة،ثم سكتَ ساعة ، ثم قال: تعلموا سورة البقرة وآل عمران فإنهما الزهراوان وانهما تظلان صاحبهما يوم القيامة كأنهما غمامتان أو غيايتان أو فرقان من طير صواف ، وان القرآن يلقى صاحبه يوم القيامة حين ينشق عنه القبر كالرجل الشاحب فيقول له: هل تعرفني؟ فيقول ماأعرفك ، فيقول: أنا صاحبك القرآن الذى أظمأتك فى الهواجر وأسهرت ليلك، وان كل تاجر من وراء تجارته وانك اليوم من وراء كل تجارة ، فيعطى الملك بيمينه والخلد بشماله ، ويوضع على رأسه تاج الوقار ويُكسئ والداه حُلتين لايُقَوَّمُ لهما أهل الدنيا..

فيقولان : بم كُسِينا هذه ؟؟! ويُقال لهما: بأخذ ولدكما القرآن .. ثم يقال له : اقرأ واصعد فى درج الجنة وغرفها ، فهو فى صعود مادام يقرأ هَذًّا كان أو ترتيلا﴾

دارمی ڕیوایەتی کردووە ژمارەی فەرمووده(٣٢٥٧)، ئەحمەدیش ژمارەی فەرمووده(٢١٨٧٢)..

واتە/ فێری سوورەتی( البقره ) ببن ، چونکە وەرگرتنی بەرەکەتەو واز لێهێنانی پەشیمانی وحەسرەتەو، جادووگەرەکانیش هیچیان بۆ ناکرێ بەرامبەری، ئنجا ماوەیەك بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی: فێری سورەتی (البقرة)و(آل عمران) ببن، چونکە دوو نوورو ڕۆشناین وسێبەر بۆ خاوەنەکەیان دەکەن وەك دووپەڵە هەور یان دووشتی سێبەرکەر یان پۆلێك باڵندە،،، لەکاتێکیشدا مرۆڤ لەگۆڕ دێتە دەرێ ، قورئان لە شێوەی پیاوێکی ڕەنگ زەرد دێتە لای ودەڵێ.. دەمناسی؟ دەڵێ: ناتناسم ! دەڵێ: من قورئانی هاوەڵتم ، ئەو قورئانەی کە بەڕۆژ گەرووتم ووشك دەکرد و بەشەویش شەونخونیم پێدەکردی ، بەڕاستی هەموو بازرگانێك چاوی لەدوای بازرگانی‌یەکەیەتی‌کە شتێکی لێوە دەست بکەوێ، بەڕاستی ئەمڕۆ تۆش خاوەنی ئەو هەمووبازرگانی‌یەی کە لە دنیادا ئەنجامت داوە بۆ خوا، بۆیە بەدەستی ڕاستی موڵکی دەدرێتێ وبەدەستی چەپی نەمری دەدرێتێ‌و، تاجی وەقار دەنرێتە سەرسەری و، باوك ودایکیشی قاتی بەنرخ و گرانبەها دەکرێتە بەریان کە هەموو ئەهلی دنیا ناتوانن هەقەکەی بدەن ، دەڵێن: بەچی ئەم بەرگەمان پێپۆشرا ، پێیان دەوترێ: بەوەی کە مناڵەکەتان قورئانی وەرگرتووەو کاری پێکردووە ، ئنجا بەقورئان خوێنەکەش دەوترێت: بخوێنەو سەرکەوە بەقادرمەی بەهەشت و ژوورەکانیا (هەروەك چۆن لە دنیادا دەتخوێن )، بەو جۆرە لە بەرزبوونەوەدا ئەبێ ، مادام بخوێنێ جا بەپەلە بخوێنێ یان بە تەرتیل....

ئەمە بێجگە لەوەی کە قورئان وڕۆژوو شەفاعەت دەکەن وحەزرەت دەفەرموێ :
(الصيام و القرآن يشفعان للعبد يوم القيامة)ئەحمەد ..

## قورئان خوێنی بۆن خۆشی تام خۆش

حەزرەت –ص–دەفەرموێت ﴿ مثل المؤمن الذى يقرأالقرآن مثل الأُتْرُجَة ريحُها طيب وطعمُها طيب ، ومثل المؤمن الذى لايقرأالقرآن مثل التمرة لاريح لها وطعمُها حُلو ﴾بخاری .. واتە : وێنەی ئەو موسڵمانەی کە قورئان دەخوێنێ و لەهەمان کاتدا کاری پێدەکات وەك لیمۆ وایە هەم بۆنی خۆشەو هەم تامی خۆشە ، وێنەی ئەو موسڵمانەش کە قورئان نەخوێنێ، بەڵام کاری پێبکات ، وەك خورما وایە هەرچەند بۆنی نیە بەڵام تامی خۆشە ..

هەروەها حەزرەت –ص– دەفەرموێت :( تعلموا القرآن و اقرؤه ، فان مثل القرآن لمن تعلمه فقرأه ، كمثل جراب محشو مِسكاً ، يفوح ريحه فى كل مكان ، ومن تعلمه فيرقد –وهو فى جوفه – فمثله كمثل جرابٍ أوكى على مِسك ) ترمذى ..

واتە فێری قورئان ببن وبیخوێنن ، نموونەی قورئان بۆ کەسێك فێری بێت و بیخوێنێت وکاری پێبکات وەکو هەمبانەیەکی پڕ میسك وایە کە بۆنی خۆشی بەهەموو لایەکدا بڵاودەبێتەوە و ، هەر کەسێکیش فێری بێت و هەڵنەسێت لە شەونوێژدا بیخوێنێت وەکو هەمبانەیەکی پڕ لە میسکی سەرمۆرکراوە ..

پیاوێك پرسیاری کرد لە حەزرەت –ص– کام کردەوەیە زۆر خۆشەویستە لای خوا ؟ فەرمووی ﴿ الحال المرتحل ﴾ واتە ئەوەی کە بەردەوام قورئان دەخوێنێ‌و هەر کە خەتمی کرد سەر لەنوێ دەست پێدەکاتەوە ..ترمذى ..

بەڵێ قورئان سەیرکردنی عیبادەتەو خوێندنیشی عیبادەتەو مایەی نزیك بوونەوەیە لەخواو مایەی دابەزینی سەکینەت و رەحمەتە ..حەزرەت –ص– دەفەرموێت : ﴿ وما تقرب العباد الى الله بمثل ما خرج منه ﴾ ترمذى ..

واتە :بەهیچ شتێك لە خوا نزیك نابنەوە وەك قورئان کە لەلای خۆیەوە هاتووە..

# هیممەت بەرزان

١- زۆرجار خۆمان دەخەڵەتێنین بەوەی کە دەڵێین کاتمان نیە وخۆمان ئەدزینەوە لەقورئان خوێندن ، یان بەهەزارحاڵ کاتێکی (ضائع ) و سەقەتی ئەدەینێ کە هیچی تیا حاڵی نابین ..لە کاتێکدا کەسانی واش هەیە بۆ خوا سوڵحاون وڕەنگە لەمن و تۆش زۆر سەرقاڵتربن ، کەچی کاتی باشیش ئەدەن بە قورئان ..دۆستی خۆشەویستم (کاك ئەدیب ) ئەندازیار بوو لە دەزگای فریاکەوتنی ئیسلامی جیهانی لە شاری دهۆك ، چەند ساڵێك لەمەوبەر بەیانیەکیان لە خەو هەڵنەستایەوەو گیانی سپارد بە خوا ، دیارە کۆچکردنی زۆر کاری تێکردین ، بەلام ئەوەی کە ئێمە نەماندەزانی لەبارەیەوەو زۆر بۆمان بوو بەدەرس ئەوە بوو کە هاوسەرەکەی پاش وەفاتی وتی : ڕەحمەتی لەوەتەی من ناسیومەو بوومەتە هاوسەری ، زیاتر لە بیست ساڵە پێنج فەرزە بەجەماعەت نوێژی دەکردوو هەموو شەوێك پێش نوێژی بەیانی شەونوێژی دەکردو ڕۆژی سێ جزم قورئانیشی دەخوێند ..

(ئەمە بێجگە لەوەی کە ئێمە ئەمان دی پیاوێکی ڕووخۆش ورەوشت بەرزو خێرەومەند بوو ، خوای گەورە بە بەهەشتی بەرین شادی بکات )

٢-دایکی سەعد ژنێکی نابینایەو تەمەنی حەفتا ساڵە و، خەڵکی ئەسکەندەریەی وڵاتی میسرەو، هەموو قورئانی لەبەرەو بە حەوت ( قراءة ) دەخوێنێ ودەماودەم قورئانی لە مامۆستاکەیەوە وەرگرتووە وبە بیست وسێ مامۆستا دەگاتەوە سەر پێغەمبەر (ص) ..

ڕۆژانە قوتابی لەهەموو جیهانی ئیسلامەوە سەردانی دەکەن و قورئانیان فێردەکات ولەسەردەستیا ئیجازە وەردەگرن ..

یەکێ لە قوتابییەکانی کە نابینا دەبێ‌و پێنج ساڵ قورئانی فێردەکات ، داوای لێدەکات کە شووی پێ بکات وبەمەش خێزانێك پێکەوە دەنێن کە هەرچەند نابینان ، بۆ سی ساڵ بەیەکەوە لەخزمەتی نووری قورئاندا دەبن ..

پیاوەکەش ئەوە حەوت ساڵە ئەم دنیا فانیەی بەجێهێشتووە ودایکی سەعد بەتەنها هەر خەریکەو ڕەحمەتی خوایان لێبێت ..

( بەرنامەی الحیاة حلوة /جاسم المطوع ) ٢٠٠٣/٤/٣٠ ..کەناڵی / اقرأ ...

## ویستگەی قورئانی

١- ئەوەی لە ژیاندا پێویست بێت قورئان باسی کردووەو تیشکی خستۆتە سەر هەروەك دەفەرموێت ( مافرطنا فی الکتاب من شیء ) الانعام ٣٨و (ونزلنا الیك الکتاب تبیانا لکل شیء و هدی ورحمةو بشری للمسلمین )النحل ٨٩

جا بۆیە هەرکەس بەویژدانەوە سەیری بکات ،دان دەنێت بەوەدا کەئەم قورئانە لەلایەن خواوە نێردراوە ، بیانی یەك دەڵێ :ئەگەر ئەم قورئانە لە چۆڵەوانی و بیابانێکیشدا بدۆزرێتەوە ، ئەوەی بیخوێنێتەوە دەزانێت فەرموودەی خوایە ..

هەروەها( نبیا ابوت ) ژنە مامۆستای دیراساتی سامی لە زانکۆی (الملکة) لە کالیفۆرنیا دەڵێت : قورئان ناوەرۆکی هەرچی بێت دەستکردی مرۆڤ نیە ، جا ئەگەر نکوڵی بکەین لەوەی کە لە خواوەیە ،ئەوە مانای وایە محمدمان بە خوا داناوە ...ل /٢٢/ کیف نتعامل مع القران العظیم /القرضاوی ..

٢- قورئان تاقە پەڕاوی ئاسمانی‌یە کە کەس نەیتوانیوە دەستکاری بکات و تەنانەت نوسخەی قورئانی زەمانی حەزرەتی عوسمان ماوە، یەکێکیان لە (دار الکتب)ی شاری لینینگراد بوو ، پاشان گواسترایەوە بۆ بەریتانیاو ، یەکێکی تریان لە شاری طاشقندی پایتەختی اوزبکستانە و تائەمڕۆش پارێزراوە ، جا ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ قورئانێکی بەردەستماندا هیچ جیاوازی‌یەکی تیا نابینین ..چونکە خوا پەیمانی داوە بیپارێزێت ( انا نحن نزلنا الذکر وانا لە

لحافظون ) الحجر /٩ ، لەکاتێکدا تەورات پاش سەدان ساڵ لە کۆچی دوایی حەزرەتی موسا نووسرایەوەو بەردەوامیش تا ئەمڕۆ دەستکاری کراوەو شتی وای تیایە لە بێ ئەدەبی بەرامبەر پێغەمبەران سەر سپی دەکات !! تەنانەت هەندێ لە رۆشنبیرانی خۆرئاوا داوایان کردووە کە لە قوتابخانەکاندا نەخوێنرێت ..

وەپاش لێکۆڵینەوە دەرکەتووە کە لە سێ پەڕاوەوە وەرگیراوە (١- نشيد اخناتون ٢- حِکَم امينوبی ٣- قانون حمورابی ) ..

ئینجیلیش بەهەمان شێوە ، دوای ماوەیەکی زۆر نووسرایەوەودوای سێ سەد ساڵ زیاتر لە حەفتا ئنجیل چواریان هەڵبژارد ، بەمەرجێ ئەو چوارە کەس پێشتر ئیعترافی پێنەدەکردن و بە زۆری کاربەدەست و بە ئاگرو بە ئاسن فەرزیان کرد بەسەر خەڵکدا ....ل/٣٠ هەمان سەرچاوە ..

٣- قورئان ئاسان کراوە بۆخوێندن و تێگەیشتن (ولقد يسرنا القران للذكر فهل من مدكر ) القمر/١٧

تەورات و ئینجیل تەنانەت زانا ئاینیەکانیشیان لەبەریان نیە ،کەچی قورئان بە ملێونەها کەس بە پیاوو ئافرەت و پیرو گەنج ومناڵەوە لە بەریانەو نەک هەر ئەوانەی کە عەرەبی دەزانن بەڵکو ئەوانەش کە نایزانن بەجۆرێك دەیخوێنن هەر دەڵێی کاسێتن و قورئانیان لەسەر تۆمار کراوە ..

مامۆستا قرضاوی دەڵێ من لە دە ساڵیدا هەموو قورئانم لەبەر کردوو، لەم ساڵانەی دوایشدا مناڵێکی بەنگلادیشی نۆ ساڵم بینی کە هەموو قورئانی بەچاکی لەبەربوو ..

هەروەها لەساڵی ١٩٩٨ دا محمد حسين طباطبائی تەمەن حەوت ساڵم بینی کەبەبێ ئەوەی ناوی خۆی بزانێ بەعەرەبی هەموو قورئانی بەچاکی لەبەر بوو جا نەك هەر موسڵمان بەڵکو یەکێکی وەك زەعیمی سیاسی قیبتی(مكرم عبيد )

لە میسر ئایەتی زۆری لەبەر کردبوو لە وتارەکانیدا بە شانازیەوە بەکاری دەهێنا.....

هەروەها ئەدیبی گەورەی قیبتی (دکتور نظمی لوقا )ش بەهەمان شێوە بوو ،هەروەك خۆی ئاماژەی پێدەکات لە سەرەتای پەڕاوەکەیدا (محمد الرسالة والرسول) !!! ..ل/١٣٢/هەمان سەرچاوە ..

٤-ئەوانەی ئەهلی قورئانن ئەوانە ئەهلی خوان حەزرەت -ص- دەفەرموێت(اهل القران هم اهل الله وخاصته ) احمد/ هەروەها لەگەڵ فریشتە بەڕێزە پایە بەرزەکاندان ، وەئەوەش کە دەیخوێنێ و بەگران فێری دەبیٚ و بۆی لەبەر دەکرێت دووقات پاداشتی بۆ هەیە ،حەزرەت دەفەرموێت ( الماهر بالقران مع السَفَرَةِ الكِرامِ البَرَرَةِ والذى يقرأ وهو يشتد عليه له اجران )بخارى

٥-پێغەمبەر -ص- رەوشتی قورئانی بوو( كان خلقه القران ) بۆیە دەبیٚ قورئان خوێن بەڕاستی مەشخەڵداری قورئان بێت وعاتیفی ونەفام نەبێت لەگەڵ نەفاماندا ، چونکە میراتگری پێغەمبەرانە ، حەزرەت دەفەرموێت : ( من قرا القران فقد استدرج النبوة بين جنبيه ، غير انه لايوحى اليه ، لاينبغى لصاحب القران ان يجد مع من وجد ، ولا يجهل مع من جهل ، وفي جوفه كلام الله ) حاكم /

٦- چۆن تا ئاوێنەیەك پاك نەبێت خۆتی تیا نابینی بەچاکی ، هەروا دڵ و نیەتیش ئەگەر پاك نەبن سوود لە قورئان وەرناگرین ، بۆیە بۆ وردبوونەوە لە قورئان دەبیٚ دڵ و دەروونمان پاك بکەینەوەو تەوبە بکەین و خۆمان بپارێزین لە نەخۆشیە دەروونیەکان ، وەك لووت بەرزی لەئاستی هەقدا ..

قزرئان دەفەرمووێت : (تبصرة و ذكرى لكل عبد منيب ) ق /٨ (وما يتذكر الا من ينيب ) غافر /١٣ ( ساصرف عن اياتي الذين يتكبرون فى الارض بغير الحق ) الاعراف /١٤٦ ..

٧=ئەو دڵەی پاك بێت لە قورئان تێرنابێت ،حەزرەتی عوسمان دەڵێت : ( لو طهرت القلوب لم تشبع من قراءة القران ).

٨- قورئان خوێن ئەبێ‌خۆی رابێنێ‌و بزانێ‌ كە ئەوەی دەیخوێنێ‌ فەرموودەی خوایەو وەك ئەوە وایە خوا لەگەڵی بدوێت ، پیاو باشێك دەڵێت :قورئانم دەخوێندو چێژم لێوەرنەئەگرت ، تا ئەو كاتەی خوێندم هەروەك لەدەمی موبارەكی حەزرەتەوە وەری بگرم ، پاشان دەمخوێند هەروەك گوێم لێبێت جوبرائیل بۆ پێغەمبەری بخوێنێت ، ئنجا گەیشتمە ئەوەی كە هەستم دەكرد كە خوای گەورە بەم قورئانە لەگەڵ من دەدوێت ..ئنجا وام لێهات كە چێژ لە قورئان وەربگرم و هەردەم لە خزمەتیدا بم ..

ئیمام جەعفەری صادق دەڵێت :(( بەخوا ، خوای گەورە خۆی پیشانی بەندەكانی داوە لە فەرموودەكەیدا (قورئان)،بەڵام نایبینن ..)) ل/١٨١/هەمان سەرچاوە ..

٩= حەزرەت -ص- دەژیا لەگەڵ قورئاندا ، بۆیە ئەگەر ئایەتێكی ڕەحمەتی بخوێندایە ، داوای ڕەحمەتی خوای دەكردو ، ئەگەر ئایەتێكی عەزابی بخوێندایە پەنای دەگرت بە خواو ، ئەگەر (سبح اسم ربك الاعلی ) بخوێندایە ، دەیفەرموو :سبحان ربی الاعلی ..

١٠- ئوسەیدی كوڕی حوضەیر سورەتی كەهفی دەخوێند ، ماینەكەشی لەولایەوە بە دوو گوریس بەسترابۆوە ، پەڵە هەورێك دائەبەزێتە سەری‌و بە دەوریا دەخولێتەوە ، ماینەكەی كە ئەمە دەبینێ‌سڵی لێدەكات وهەڵدەسڵەمێتەوە ، بۆبەیانی بۆحەزرەتی گێڕایەوە ، ئەویش فەرمووی :ئەوە ئارامی‌و سەكینەت و فریشتە بووە لە بەر قورئانەكە دابەزیوە (بخاری)

## قورئان موعجیزەیە

لەپێش حەزرەتدا (ص)پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت بۆگەلێکی تایبەت و کاتێکی دیاری کراو دەنێردران وموعجیزاتیان بەپێی عەقڵی خەڵکی ئەو سەردەمانە وشتی بەرچاوو کاتی بوون و ئەوەی لەو کاتەدا بیدیایە حوججە بوو لە سەری ..

خەڵکانی زەمانی حەزرەتیش (ص) وەك زەمانی پێشوو حەزیان بە موعجیزاتی ماددی و بەرجەستە دەکرد وپێویستیش بوو ، بۆیە پەروەردگار بە میهرەبانی خۆی لەو جۆرە موعجیزانەی پیشان دان ، تاحوججە بێت بەسەر ئەو کەسانەوە کە لەو کاتەدا دەیانبینی ..

بۆنموونە لەپێش پێغەمبەریدا ، مەیسەرە لەگەڵ حەزرەتدا چوو بۆ بازرگانی بۆ خەدیجە ، لەرێگا تێبینی دەکرد هەور سێبەر دەکات بۆ حەزرەت ، بەلایەوە سەیر بوو ، جابۆئەوەی دڵنیابێت کە ئەمە بۆ ئەوە بە حەزرەتی دەووت باتۆزێك رابکەین وپێشبڕکێ بکەین ، کاتێك ڕاشیان دەکرد هەورەکە هەر بەسەر سەریەوە دەمایەوە ،جا کە گەڕانەوە ئەمەی بۆخەدیجە گێڕایەوە ..

لەکاتی پێغەمبەریشدا لەغە زایەکدا بەهەموو سوپاکە توزێك ئاویان پێمابوو لەمەنجەڵێکدا ،حەزرەت دەستی موبارەکی تێخست و هەندێ دوعای کرد ، ئیتر هاوەڵان بینیان کە ئاو لەنێوان پەنجەکانیەوە دەردەچێت و هەموو سوپاکە دەستنوێژیان گرت و بەشی پێویست ئاویان برد ..

ئەمە بێجگە لەوەی کە حەزرەت هەندێ شتی دەفەرموو ، پاش ماوەیکی کورت یان درێژ وەك ڕۆژی ڕووناك دەهاتنە دی .. بۆ نموونە :

لەغەزای تەبوكدا لە ناوچەی تەبوك کە وشکوبرنگ و بێسەوزایی بوو هاوەڵان شپرز بوون بۆ ئاو ،حەزرەت (ص ) هاتە سەر بیرێکی بێ ئاوو دەستی

موبارەکی تێخستو هەندێدوعای خوێندو ئاو سەری کرد ، هاوەڵان تێر ئاو بوون ..ئنجا حەزرەت (ص)بە موعازی کوڕی جەبەلی فەرموو ﴿ یوشك یا معاذ ان طالت بك حیاة ان تری ماهاهنا قد مُلیء جنانا ﴾موسلیم ..واتە :ئەگەر تەمەنت درێژ بێت ، ئەی موعاز ، ئەم ناوچەیە دەبینی کە پڕبووە لە باخ و بێستان و سەوزایی ..

ئێستا دیراسە کراوە لەلایەن زانا جیۆلۆجیەکانەوە کە زۆرترین ئاوی کۆبۆوە لە هەموو نیوە دورگەی عەرەبدا وا لەژێر ناوچەی تەبوك داو ، سوودی لێوەرگیراوەو ئێستا دەبینی کە پڕبووە لەباخ وبێستان و سەوزایی ، بەجۆرێك کە گوڵ ومیوەی هەمەجۆر دەنێرن بۆ وڵاتە ئەوروپیەکان ..

هەروەها حەزرەت (ص) هەواڵیدا کە نیوە دورگەی عەرەب و میسرو قوستەنتینیە وڕۆما فەتح دەکرێن ، هەموویان هاتوونەتە دی و تەنها ڕۆما ماوە ، کە دیارە ئەویش دێتەدی وەك ئەوانی تر ، ئیتر بە جەنگ بێت یان بە ئاشتی لە ڕێی بانگەوازەوە چونکە ﴿ وما ینطق عن الهوی ان هو الا وحی یوحی ﴾..

موعجیزەی هەتاهەتایی حەزرەتیش (ص) کەحوججەیە لە سەر بەرەی ئادەمی ، قیامەت قورئانە ، کە هەرچی بەبێ‌دەمارگیریو ، بەویژدانەوە بیخوێنێت دڵ و دەروونی دەهەژێنیو کەمەندکیشی دەکات بەرەو هەق وڕاستی ..

## موسڵمان بوونی خێزانێکی جوولەکە

( یوسف کوهین )ی تەمەن سی وشەش ساڵ شوێنکەوتوی بزووتنەوەی شاسی جوولەکە بوو لە ئیسرائیل ، لەڕێی ئینتەرنێتەوە گفتوگۆی کرد لەگەڵ زانایەکی موسڵمانداو پاش لێکۆڵینەوەی زۆر خۆی و ژنەکەیو چوار منداڵەکەی موسڵمان بوون لە ساڵی ٢٠٠١ داو بوو بەن بەدەنگوباسی سەرلاپەڕەی ڕۆژنامەکانی ئیسرائیل و هەر یەکەیان لەگۆشەیەکەوە قسەیان لێدەکرد ..

ناوبراو ناوی خۆی گۆڕی بۆ یوسف خەتاب و لۆنای هاوسەریشی جلوبەرگی ئیسلامی پۆشی ومالّیان گواستەوە لە (نتیفوت )ەوە بۆ دێی (طـــور ) لـە قودسی ڕۆژ هەلاّت و منالّەکانیشیان هاوینان بەشداری دەکەن لە و دەوراتانەی کـە بزووتنـەوەی حـەماس دەیکەنـەوە .. ئینتـەرنێت –پێگـەی الاسـلام الیـوم ٢٠٠٢/٨/١٥ ..

## موسلّمان بوونی قەشە ئیبراهیم فلوبرس

ناوبراو لەسالّی ١٩١٩ ز دا لـە ئەسکەندەریەی میسر لـە خێزانێکی گـاور لەدایك بووەولەسالّی ١٩٤٨ ز دا زانکۆ تـەواو دەکـات و چوار سـالّ خـەریکی مژدەدان دەبێت لـەناو موسلّمانانداو هـەولّی زۆرئـەدات بۆ ساردکردنەوەیان لـە ئیسلام و ئنجا نامەی ماجستێرەکەی دەنووسێ بەناوی (کیف ندمر الاســـلام بالمسلمین) ..

لەگەلّ ئەو هەموو دوژمنایەتەی بۆ ئیسلام ، ناوبراو لە سالّی ١٩٥٥ دا گوێـی لە ئایەتی ﴿قل اوحی الی انه استمع نفر من الجن فقالوا انا ســـمعنا قـــرانا عجبا ، یهدي الی الرشـــد فامنـــا بـــه ..﴾ دەبێت و ئەدا لە دلّی و هـەر کە دەچێتـەوە مالّـەوە و ســـەیری ســـورەتی (الجـــن ) دەکـــات و چـــەند جـارێك دەیخوێنێت و ئنجا دەگەڕێت بەدوای ئەو مژدانەی کە دراون بە هاتنی محمد (ص) لە تەورات و ئینجیلدا ،وەك ئەوەی کەلەتەوراتدا (سفر اشعیا اصحاح ٧٩ )کەدەلّێت : ( او یرفع الکتاب لمن لایعرف القراءة ولا الکتابة ویقول له اقـرا ، یقول ما انا بقارئ )

واتە : ( ئەوەی کەناخوێنێو نانووسێت و پەڕاوەکەی بۆ دێت و پێی دەوترێت بخوێنـە ، دەلّێت خوێنـدەوار نیـم ) هـەروەك لـە ئینجیلـی یۆحەناشـدا هـاتووە ( اصحاح ١٤ ) ( انا اصلی الی الله لیعطیکم معزیا اخر لیمکث معکم الی الابد

روح الحــق ) واتـه : (حـەزرەتی عیسا فـەرمووی مـن دەپارێمـەوە لـەخوا کـە پێغەمبەرێکی ترتان بۆبێت و، لەگەڵتان بمێنێتەوە بۆ هەتا هەتایی ) .
دیـاره ئـەو مژدانـە هـەمووی ئامـاژەیـە بـۆ هاتـنیحەزرەت (ص) ..سـەرەنجام ئیبراهیم موسڵمان بـوو ، هەرچـەند تووشـی چەرمەسـەرەیی زۆرهـات ، کۆڵـی نـەداو بـووە بـانگخوازێکی چـاك بۆئیسـلام وخـەڵکێکی زۆر لەسـەلر دەسـتیا موسڵمان بوون ، بۆنموونـه لـه سـاڵی ١٩٧٩ دا سیانزه قەشـەی سـۆدان لەسـەر دەسـتیا موسـڵمان بـوون و کەوتـنە بانگـەواز کـردن لـه خۆرئـاوای سـۆدان داو ئەوانیش بەهەزاران بتپەرست لەسەر دەستیاندا موسڵمان بوون (ئینتەرنێت)..

## ئاواتەکەت هاتەدی

دکتۆر علی زانایـەکی بیرکاری یـە لەسعودیەو خـاوەنی پـەڕاوی (رواد عـــلم الصیدلة ) و(رواد علم الطب ) و (رواد علم الکیمیاء )و پـەڕاوی تـره دەڵێت :
لە ئەمـریکا دەمخوێند ، رۆژێك دکتۆر تۆماس لەگەڵ ڕاگری کۆلێژەکەماندا هات و موحازەرەیـەکی بۆدایـن لەسـەر مێژووی زانستـەکان و ، باسـی قۆناغـەکانی پێشـکەوتنی زانسـتی کـرد وکـە گەیشـتە سـەدەی حـەوتی زاییـنی پـەڕاندی ، منیش پرسیارم لێکـرد کـه بۆچـی باسـی ڕۆڵـی موسڵمانانی نەکـرد ، ( ڕاگـری کۆلێژەکەمان پرسیارەکەمی پیٚ ناخۆش بوو ) ..ئەویش وتی ڕاستە موسڵمانان ڕۆڵێکی گەورەیان بینیوە لە بەرەو پێش بردنی زانستدا ..
لـەدوای ئەوەوە بیست ساڵ دۆستی یەك بووین و هەرئەو بووە سەرپەرشتیاری نامەی ماجستێرو دکتۆراکەم ..
زۆرجـار گفت وگۆمـان دەکـرد لەسەر ڕۆڵـی موسـڵمانان لـه مێژوودا و ئـەمووت: ئەوەتـە موسڵمانان لە ئەندەلوس داهێنـەری تۆپ بوون و لە زۆر بواری تریشدا داهێنانیان کردووە ، خۆزگە موسڵمان ببویتایە ..

من گەڕامەوە ولاتی خۆم و ڕۆژێك كچەكەی لە ئەمریكاوە تەلەفونی بۆكردم و هەواڵی دامیٚ كە باوكی مردووەو ، وتی : هەرچی كارتی هەبووبیٚ لای باوكم حەزم كردووە ئاگاداری بكەم ..بەلاّم ئەوەی سەیرە لەسەر كارتەكەی تۆ نووسراوە ( دكتۆر علی ئاواتەكەت هاتەدی ) ... ئیتر لەخۆشیدا فرمێسك هات بەچاومداو زۆر سوپاسی خوام كرد كە بەموسڵمانی لە دنیا دەرچووە ..

شایانی باسە دكتۆر علی ئەوەندە بلیمەت و زیرەكە لە بواری بیركاریدا ، سالاّنە كە لە یابان مەتەڵێكی بیركاری دائەنێن وجائیزە بۆ براوە دیاری دەكەن ، هەمیشە مەرجێكیشی بۆ دائەنێن كە نابیٚ دكتۆر علی بەشداری بكات چونكە بە دڵنیایی هەموو ساڵێك ئەو براوە دەبێت ..

## مامۆستای مرۆڤایەتی

ئەم قورئانە پەڕاوێكی بیٚ وێنەیە لە جیهان دا و، بانگخوازی بەئەمەك و ماندوو نەناسی دەویٚ كە بەژیری و بەدانایی بیگەیێنێت ، قورئان هەروا نەدرایە دەست مرۆڤ بیخوێنێتەوە ، بەڵكو مامۆستایەكیشی لەگەڵ نارد كە بەو پەڕاوە پەروەردەیان بكات و بە ڕەوشتی جوانی سەرمەشق بێت بۆیان .....

حەزرەت (ص) لە نەفسیەتی بەرامبەرەكانی تێدەگەیشت و هەركەس بەپیٚی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەكرد ....

كاتێك حەزرەت (ص)و موسڵمانان قوربانیان پێش خۆیان داو هاتن بەرەو مەككە ( عومرە) بكەن ، قورەیش ناڕازی بوون و نوێنەریان نارد بۆ دانوستان لەگەڵ حەزرەتدا ..

یەكیٚ لەوانەی هاتن لە خێڵی ( كنانە ) بوو ، ناوی ( حلیس ) ی كوڕی(علقمە ) بوو ، حەزرەت (ص) كە لە دوورە وە بینی ، بە هاوەڵانی فەرموو : ئەوە فلان كەسە لە خێڵێكە زۆر حەزیان لە وشترە ، وشترەكانی قوربانی بەرەو ڕووی

بەرن و نیشانی بدەن ، نیشانیاندا و بەدەنگی بەرز( لبیك اللهم لبیك) یان دەووت، کە حلیس ئەو حاڵەی بینی وتی ( سبحان الله) هیچ مانای نیە نەهێڵرێت بچنە بەیتەوە ، دوای گفتو گۆ گەڕایەوە لای قورەیش و ووتی پێم باشە ڕێ یان لێ نەگرن ، بەقسەیان نەکرد .

( عروە ) ی کوڕی ( مسعود ) ی ( ثقفی ) یش هات ، حەزەرت (ص) دانوستانی لەگەڵ کردو ، ( عروە ) ووتی : ( محمد ) چۆن مرۆڤ کەس و کاری خۆی ڕیشە کیش دەکات ، ئایا پێش خۆت بیستووتە هیچ کەسێك خزم و خۆیشی خۆی ڕابماڵێت ؟ خۆ ئەگەر ئەوی تریشیان بێ وەڵاهی من کۆمەڵێك دەموچاوو هەرچی و پەرچی دەبینم لە پشتەوەن هەر کە لێت قەوما ڕادەکەن و بێ کەس دەمێنیتەوە ، ئەبوبەکر هەڵیدایەو ووتی ! قوڕ بەسەر عەقڵی تۆ و ( لات ) یش ، ئێمە هەڵدێین و ڕادەکەین !!...

لە ماوەی مانەوەیدا حەزرەت دەستنوێژێکی لەبەر چاوی شت ، عروە بەچاوی خۆی بینی کە چۆن دڵۆپی ئاوی دەستنوێژکەی نەدەکەوتە سەر زەوی و هاوەڵان بۆ موبارەکی دەیان برد و دەیانهینا بەدەم و چاو و لەشیاندا (ئەمەش بۆئەوەی بۆی بسەلمێنێ کە موسڵمانان چۆنن لە خزمەت حەزرەتدا (ص) ..

کاتێ گەڕایەوە ، بە قورەیشی وت : بە خوا من چووم بۆ لای پادشاکان و، قەیسەر و کیسری و نەجاشیم بینوە ، کەسم نەدیوە هاوەڵەکانی ئاوا ڕێزی لێبگرن و بە گەورە سەیری بکەن ، ڕێ یان بدەن با عومرەی خۆیان بکەن ... بە قسەی ئەمیشیان نەکرد ...

ئنجا ( مکرز بن حفص ) هات ، حەزرەت هەر کە لە دوورە وە بینی فەرمووی ئەوە (مکرز ) ، پیاوێکی فاجرە .... ئەمیش سوودی نەبوو ...

ئنجا قورەیش ( سهیل ی کوڕی عمرو ) ی نارد تا سوڵح بکات و پەیماننامەیەك بەرهەم بهێنێ ، هەر کە لە دوورەوە دەرکەوت ، حەزرەت گەشبین بوو فەرمووی ئەم پیاوە هات کار ئاسانیتان بۆ بکات ، مادامەکی ئەمەیان ناردبێت کەواتە قورەیش سوڵحی پێخۆشە ... ( هەرواش دەرچوو ) .

کە ڕێکەوتن ... یەکێ لە بەندەکانی پەیماننامەکەش ئەوە بوو ، ئەگەر(پیاویك ) لە مەککەوە هات بۆ مەدینە حەزرەت (ص) تەسلیمی بکاتەوە ، ئەگەر لە مەدینەوە چوو وە بۆ مەککە ئەوان تەسلیمی نەکەنەوە ، لەو کاتەدا ، ( ئەبو جەندەل کوڕی سوهەیل ) کە لە موسڵمانە چەوساوەکانی مەککە بوو ڕای کرد بوو، هات بۆ لای حەزرەت ، سوهەیلی باوکی وتی : کەواتە ئەیبەمەوە ، ئێمە ئێستا پەیمانمان بەست .. ئەبو جەندەل ، وتی : موسڵمانان چۆن بگەڕێمەوە و، تووشی فیتنەم بکەن و سزام بدەن..... حەزرەت (ص) فەرمووی : ( ئەبو جەندەل) ئارام بگرە و چاوەڕوانی پاداشتی خوا بە ، خوا یار بێت خوای گەورە چارەسەرێك بۆ تۆ و هاوڕێکانت دەدۆزێتەوە ، ئیمە تازە پەیمانمان داوە نابێ پەیمان شکێنی بکەین ... بەهەر حاڵ ئەبو جەندەل ڕۆیشتەوە و ڕازی بوو بە فەرمانی حەزرەت ..

( زۆر کەسی وا هەیە بەرگەی موقفی وا ناگرێت و ، لە دین وەردەگەڕێ ! )

دواتر ، ئەبو جەندەل و چەند صحابەیەکی تر ڕایان کرد لە مەککەو کۆمەڵێکی چەکداریان دروستکرد لای دەریای سوور و پەلاماری قافڵەی قورەیشیان دەدا ، تا قورەیش ناچار بوو خۆی ئەو بەندە هەڵوەشێنێتەوە ..

لە فەتحی مەککە دا سوهەیل چاری نەما و ویستی موسڵمان بێت ، بەڵام لە کردەوەکانی ڕابردووی دەترسا ، بۆیە کوڕەکەی نارد بۆلای حەزرەت (ص) کە پرسیاری بۆ بکات ئەویش فەرمووی : دەتوانێت بێت موسڵمان بێ و هیچی

لێناکەین .. ئنجا حەزرەت بە هاوەڵانی فەرموو : کە سوهەیل هات کەس سەیری نەکات ، ئەمەش بۆ ئەوەی تەریق نەبێتەوەو دڵی هیچ نەکات ..
ئنجا کاتێك هات هاوەڵان هەموو سەریان داخست و سەیریان نەکرد ،جا بەڕاستی ئەمە ئەوپەڕی دڵراگرتن و حسابکردنە بۆبریندارنەبوونی هەستی بەرامبەر ..
جا هەروەك پیاو باشێك دەفەرموێت : ئای چ دینێکە ئەگەر پیاوی هەبێت کاری بۆبکات ..
بەڵێ بانگخوازی بەئەمەك و خواناس و دڵسۆزی ماندوونەناس دەتوانێت خزمەتی باش پێشکەش بکات و ببێتە مایەی سەرفرازی دنیاو قیامەتی خۆی و خەڵکی ..
لە کۆتاییدا لەخوای گەورە دەپاڕێینەوە هەروەك حەزرەت (ص)، کە خۆشەویستی خۆی وهەموو ئەوشتانەمان بداتێ کە خۆشەویستی‌یەکەی سوودی هەیە بۆمان لای خوا، وە دەپاڕێینەوە لێی کەهەر شتێکی داینێ کەحەزی پێدەکەین وخۆشمان دەوێت، ببێتە هێزو تواناو هاندەرمان بۆ ئەو شتانەی کەخوا خۆشی دەوێن، وە هەرشتێکی نەداینێ لەوەی کەحەزی پێدەکەین وخۆشمان دەویێ بیکا بەدەست بەتاڵی بۆمان تا خەریکی ئەو شتانە بین کە ئەو حەزی پێ دەکات وخۆشی دەوێن.
(اللهم ارزقني حبّك وحبّ مَنْ ينفعني حبه عندك ، اللهم ما رزقتني مما احب فاْجعله قوة لي فيما تحب، اللهم وما زويت عني مما أحب فاجعله فراغا لي فيما تحب) الترمذي(٣٤١٣)..تا بەیکگەیشتنەوەیەکی تر بەو خوایەتان دەسپێرین کە سپاردە زایە ناکات ..هەر شادو سەر فرازو دروست بن ..

## سەرچاوەکان


١= تەفسیری ئاسان –ماموٚستا بورهان محمد ئەمین

٢= التاج الجامع للاصول فی احادیث الرسول / وەرگێڕانی ماموٚستا نوری فارس

٣= قواعد التدبر الامثل لكتاب الله عزوجل /عبدالرحمان المیدانی

٤= تیجان البیان فی مشكلات القران /الخطیب محمد امین العمری / تحقیق /حسن الرزو

٥= بلاغة الكلمة فی التعبیر القرانی / د. فاضل السامرائی

٦= لمسات بیانیة فی نصوص من التنزیل/ د.فاضل السامرائي

٧= كیف نتعامل مع القران العظیم / د.یوسف القرضاوی

٨= مجلة الاعجاز ... ٩= گوٚڤاری هەیڤ

١٠= گولاٚوی سەر موٚر /موبارەكفوری

# ناوەڕۆك